# گرانیی گەورە



# لەکوردستاندا

## ١٩١٤-١٩١٨ز

نووسین و ئامادەکردنی:
محەمەد جەمال توتمەیی
بەختیار محەمەد ئەمین بیتواتی



**ناسنامەی کتێب**

بابەت: مێژوو ی زارەکی

ناوی کتێب: گرانیی گەورە لە کوردستاندا (١٩١٤ - ١٩١٨ ز).

نووسین و ئامادەکردنی: محەمەد جەمال تۆتمەیی و بەختیار محەمەدئەمین بێتواتی .

خاڵبەندی: م. اسماعیل حسن حسین.

تایپ: بەختیار محەمەدئەمین عوسمان (نووسەر).

دیزاینی ناوەوە: فوئاد یاسین

بەرگ: ئیبراهیم ساڵح

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٥٠٠٠

چاپی دووەم ساڵی٢٠٢٢

چاپخانە:



لە (بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان) ژمارە سپاردنی (٧٢٥) ی ساڵی (٢٠٢١) ی پێدراوە.

# گرانیی گەورە

## ساڵی گرانی، ساڵی لیرەی بە بەها، ساڵی قاتوقڕی، ساڵی تاعوون، سەفەربەلك، سەفەری نادیار، سەفەربەر، ڕەشبگیری لە کوردستاندا

## (١٩١٤ - ١٩١٨)

((فریای میللەتی کورد بکەون، کە لەو شاخانەدا لە برسان ناچار بوون گیا دەخۆن.... من چی بکەم؟ دەنگم بگەیەنمە پاریس، بۆ ئەوەی فریای میللەتی کورد بکەوێ، تۆ واتا چیا، لە جیاتی ئێمە دەنگمان بگەیەنە بەو ولاّتانە و داوای ناردنی خواردنیان لێ بکە، پێویستیمان بە قوتابخانە هەیە، پێویستیمان بە هەموو شتێك هەیە، کە بەرەو شارستانیمان ببات، من باوەڕم بە ڕوس و تورك و ئێران نییە، ئێوەن هیوای ئەوەتان لێ بکرێت، یارمەتی کورد بدەن.))

## سمکۆی شکاك

((ئەگەر کورد ئالاّی هەبێت، دەبێ نەخشی کەنگری لە سەردابنێین، چونکە لە سالاّنی گرانیدا هەمیشە کەنگر بە هانای هەزاران خەڵکی برسی هاتووە و لە مەرگ ڕزگاری کردون. دەبوایە میللەتی کورد هەرگیز ڕۆژانی گرانی لە بیر نەکات، بەلاّم بە داخەوە زوو لە بیریان کرد و پەندیان لەم کارەساتە گەورەیە وەرنەگرت .))

## مەلای گەورەی کۆیی

((هەی هاوار براینە هاوارتان لێ دەکەم، لە پێناو مرۆڤایەتی، هەرچی زووتر ڕۆژگاری ئاشتبوونەوە تەواو بکەن، بۆ ئەوەی ساڵی داهاتوو، پێویستیمان بە خواردنی گۆشتی نەوەی خۆمان نەبێ .))

## ئاغا پەترۆس

**پێشکەشە بە:**

**بە گیانی پاکی قوربانیانی گرانیی گەورە...**

# ناوەڕۆك

**بە کورتی:**

دوای چاپ و بڵاوکردنەوەی چاپی یەکەمی ئەم کتێبە، بە پێویستمان زانی بۆ چاپی دووەم، پێداچوونەوەی پێدابکەین، بەپێی توانا هەوڵماندا، کەموکورتییەکان چاک و تەواو بکەین و سەرنج و تێبینی و زانیاری تازە لە هەر شوێنێك کەپێویست بکات بخەینە ڕوو ...هتد.

محەمەد جەمال

بەختیار محەمەدئەمین

٢٠٢١/١١/٦

## بەرکوڵ

حەیدەر عەبدوڵڵا:

ئاشکرایە لە دوا ساڵەکانی فەڵەمڕەویی عوسمانیەکان، گرانی و قاتوقڕیەکی گیانوەرێن و ماڵوێرانکەر ڕوو لە عێراق بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی دەکات. دیارە بەر لەم گرانییەش چەندان نەخۆشی کوشندەی وەك: تاعوون و کۆلێرە و سیل و ...هتد، تەنگیان بە خەڵکی عێراق و کوردستان هەڵچنیوە.

لەم ماوەیەدا عێراق لە لایەك لەڕووی سیاسییەوە شڵۆقاو و نالەبار بووە، عوسمانییەکان لە عێراق دوا هەناسەیان داوە و نیازی ئۆغری یەکجارییان هێناوە، بەریتانیای زلهێزیش مرخی خۆی لە داگیرکردنی خۆش کردووە. لە لایەکی دیکەیش، نەهامەتی و قاتوقڕی و نەخۆشیی کوشندە سەریان تێناوە و لە کەڵکیان خستووە.

گرانیی گەورە (١٩١٤- ١٩١٨ز) هەر تەنیا عێراق و کوردستان بە تەنیا ناگرێتەوە، بەڵکە پەل بۆ وڵاتانی ئەوسای شام: لوبنان و فەلەستین و سووریا داوێت و مەرگەساتی زۆر گەورە دەخاتەوە. بە گوێرەی سەرچاوەکان گرانیی گەورەی کوردستان سەرتاپاگیربووە و هەموو شار و لادێ و دەڤەرەکانی گرتووەتەوە، بەڵام لە هێندێك شوێن کاریگەرییەکەی زیاتر بووە. خەڵك لە برسان پشیلە و سەگ و گوێدرێژ و ماییندیان خواردەوە، جاری وا هەبووە ئەمانەیشیان دەستنەکەوتووە گۆشتی یەکتریان خواردووە.

لە ئاسمان دلۆپێك باران نەباریوە، نرخی گەنم و جۆ فڕیوە، لە هیچ شوێنێکیش هیمدادیان بۆ نەهاتووە. زەوی وشك، ئاسمان وشك، گەدە وشك،هیچ ترووسکەیەکیش لە ئاسۆوە نەبووە... ئەوەی لەبارەی ئەم گرانییە دەگێڕدرێتەوە مرۆڤتۆقێن و دڵهەژێن و جەرگبڕە، تۆ وەرە دەستت بچێتە منداڵی بچووك و سەری ببڕی و بیخۆیت!

لێرەوە جێگەی خۆیەتی بەسەرهاتێکی تراژیدی بگێڕمەوە، کە کاتی خۆی لە کتێبێکی مێژوویی خوێندوومەتەوە و کاری تێ کردووم، ئێستایش بە گەشی لە زاکیرەمدا ماوە. ڕووداوەکە ڕاستەقینەیە و ئەحمەد سۆفی مێژوونووس لە گۆڤارێکی توورکی وەریگرتووە. ژن و پیاوێك بەناوی (عەبوود ) و (خەجاوە) لە شاری مووسڵ لە کاتی گرانیی گەورەدا بە نهێنی منداڵی خەڵکیان ڕفاندووە و سەریان بڕیوە و گۆشتەکەیان بە (قلیە) لێناوە و لە بازاڕ فرۆشتوویانە. تا ماوەیەکی زۆر لەم کارە بەردەوام بوون، تا ڕۆژێك پیاوێك لە بازاڕ لە کاتی نانخواردن پارچەگۆشتێکی ڕەقی دەکەوێتە بەر ددان، کە تفی دەکاتەوە، دەبینی پەنجەی منداڵێکی بچووکە، ڕاستەوخۆ هەواڵی پۆلیس دەدات، کاتێك پۆلیس ماڵی عەبوود دەپشکنن، دەبینن بیرێکی لە ماڵەوە هەیە سەری سەد منداڵی خستووەتە ناو. دوای ئەوەی دەدرێنە دادگە، ژنەکە پێ لە تاوانەکەی خۆی و پیاوەکەی دەنێت و ددان بە هەموو شتێکدا دەنێت. کاتێك لێیان دەپرسن بۆچی ئەو کارە قێزەونەتان کرد؟ دەڵێن نەمانتوانی بەرگەی ئەو هەموو برسیەتییە

بگرین، سەرەتا بە پشیلە و سەگ دەستمان پێ کرد ، بەڵام دواتر ئەوان نەمان و ڕوومان لە گۆشتی منداڵ کرد و بە خەڵکمان دەفرۆشتەوە.

بە هەرحاڵ، عەبوود و خەجاوەی هاوژینی سواری گوێدرێژ دەکرێن و لەنێو تاپۆرەی خەڵکدا تفباران و بەردباران دەکرێن و دواتر لە سێدارە دەدرێن.

ئەمە یەك لەو تاوانانە بوو لەو گرانییەدا ڕووی داوە، سەدان و بگرە هەزاران ڕووداوی دیکە هەن هێشتا بە نهێنی ماونەتەوە، یان هەر نەنووسراون و لەبیرچوونەتەوە.

ئەم گرانییەی لە کوردستاندا ڕووی داوە تراژیدایایەکی زۆر گەورە بووە، لەوەیش ناخۆشتر کەس نەبووە چەند لاپەڕەیەکی لێ بنووسێتەوە تاکوو ئەمڕۆ ئێمە پێی ئاشنا بین. ئەوەی هەیە زۆرینەی مێژووی زارەکییە و لە گەڕیدە و لەمەلا و ئەملا وەرگیراوە، بەڵام وەك دەڵێن زەرەر لەنیوەی بگەڕێتەوە قازانجە... ئەم کارەی کاك (بەختیار بێتواتی و محەمەد جەمال توتمەیی)، هەتا بڵێی شایانی نرخاندن و دەستخۆشییە. خەڵکیان دواندووە و زانیارییان لەبارەی گرانیی گەورە لێ وەرگرتوون و تۆماریان کردووە، ئەگەرچی کارەکە زیاتر گێڕانەوەیە نەك شیکردنەوە و لێکدانەوە، لێ دەکرێ هەم بکرێتە کەرستەی ئەدەبی و هەمیش ئەکادیمی. دەستخۆشی لە هەردوو نووسەری ماندوونەناس دەکەم و داوایان لێ دەکەم لە نووسینی ئەم بابەتانە بەخیلی نەکەن.

ڕۆژگاری تفتوتاڵی کۆرۆنا
هەولێر
٢٠٢٠

## پێشەکی:

گرانیی گەورە لە کوردستاندا، ڕووداوێکی مێژوویی گرنگە و پێویستە نەوەی ئێستا و داهاتووی کوردستان، بە تایبەتی گەلی کورد، پێی ئاشنابێت.

بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە، پشتمان بە زانیاری نووسەرانی خەڵکی کوردستان و وڵاتانی تر بەستووە، هەروەها سوودمان لە چەندین گۆڤار و چاوپێکەوتنی خەڵکی بەتەمەن و تۆڕی کۆمەڵایەتیش بینیوە، کە بە شێوەی پچڕپچڕ و ڕاپۆرتی تایبەت باس لەو ڕووداوە ناخ هەژێنە کراوە. ئەوەندەی ئێمە لێی ئاگاداربین، تاکو ئێستا کتێبێکی تایبەت بەو بابەتە دەربارەی کوردستان نەنووسراوە، کە دەکرێت بۆ بە دەستهێنانی مافی خەڵکی کوردستان، بەتایبەتی گەلی کورد سوودی هەبێت.

بە دواداچوونی زۆرمان کرد و هەوڵی زۆرماندا، کەسێك یان زیاتر ببینین، کە تەمەنێکی زۆری هەبێت و ئەو ڕووداوە مێژووییە ناخهەژێنەی لە بیربێت، بەڵام بە داخەوە لە دەڤەری خۆشناوەتی و دەڤەرەکانی دەوروبەریش تاکە کەسێکمان دەستنەکەوت، هەرچەندە ئەگەر باری داراییمان باش بووایە و کاتێکی باشمان لەبەر دەم بووایە و بمانتوانیبا بە هەموو کوردستاندا بگەڕێین، ڕەنگە کەسانێك لە ژیاندا مابن کە ڕووداوەکەیان لە بیربێت.

لێتان ناشارینەوە، دەمێکە بەو لێکۆڵینەوە سەرقاڵین، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە: ئێمە هەردووکمان فەرمانبەری میرین و کاتێکی کەممان بە دەستەوەبوو. سەرەتا بە دەستپێکی ڕووداوەکە دەستمان پێکردووە، دواتر پڕژاوینەتە سەر دوو تەوەری سەرەکی کە هۆکار و دەرهاویشتەکان لە خۆ دەگرێت، کە هەر یەکێك لەو دوو تەوەرە چەند بەشێك لە خۆ دەگرێت... لە کۆتاییشدا چەند وێنەیەکی ڕووداوەکانمان، تایبەت بە خەڵکی کوردستان خستوونەتە ڕوو. پێویست بوو بەدواداچوونی زیاترمان کردبایە، بەڵام هەروەك باسمان کرد، دەرفەتمان بۆ نەڕەخسا، بۆیە لێرەوە ڕووی دەممان دەکەینە، ئەو بەڕێزانەی کە بەنیازن، لەم بوارەدا نووسین بکەن، با قۆڵی ئازایەتی لێ هەڵماڵن و دەست بکەن بە لێکۆڵینەوەی زیاتر و شیتەڵکردنی ئەو بابەتە گرنگە، چونکە ڕووداوەکان هێندە جەرگبڕن، هیچی کەمتر نییە لە ئەنفال و مەرگەساتەکانی تر.

لێرەدا هیوامان وایە بە نووسین خزمەتێکی باشی خەڵکی کوردستان، بەتایبەتیش گەلی کوردی ستەمدیدەمان کردبێ، هیواداریین لە کەموکوڕییەکانمان ببورن ....

محەمەد جەمال

بەختیار محەمەدئەمین

١/ ٦/ ٢٠٢٠

**دەستپێك:**

پێش گرانی و قاتوقڕی سەردەمی جەنگی یەکەم، چەند گرانی و قاتوقڕیەکی تر، دووچاری خەڵکی گوردستان بوونەتەوە، وەکو: گرانییەکەی ساڵانی (١٧٥٦ و ١٨٨٠)، هەریەکێکیش چەند هۆکارێکی هەبووە، بەڵام ئێمە لێرەدا تیشك دەخەینە سەر گرانییەکەی سەردەمی جەنگی یەکەم (١٩١٤ ـ ١٩١٨)، لێکۆڵینەوەکەمان لە باسی ئەو گرانییە چڕدەکەینەوە. ئەوەی لێرەدا تۆمارکراوە، نموونەیەکی بچووکی ئەو هەموو ڕووداو و کارەساتانەیە، کە ئەو کات بەسەر خەڵکی کوردستان بەگشتی و گەلی کورد بەتایبەتی هاتوون، کە دیوێکی تری قڕکردنی خەڵکی کوردستانە، بەتایبەتی گەلی کورد. سامناکی و هەستیاری و سەرنجڕاکێشی ڕووداوەکان هانیاندایین کە بەردەوام بین لە بەئاکامگەیاندنی لێکۆڵینەوەکە، ڕووداوگەلێك بە درێژایی چوار ساڵی جەنگ، کە هیچی کەمتر نەبوو لە مەینەساتەکانی تر، کە چەند لاپەڕەیەکی تری بەڵگەیی و مێژوویین و دەکرێت بخرێنە بەردەم ڕای گشتی و لە بەرژەوەندیی کورد و کوردستان سوودیان لێ ببینرێ. ئێمە لێرەدا زیاتر سەرنجمان خستووەتە سەر (قڕکردن بە ڕێگای برسی کردن)، لێرەدا هەستاوین بە کۆکردنەوەی زۆربەی ئەو بەڵگە و بابەتانەی سەبارەت بەو کارەساتە نووسراون و ئەو ڕووداوانەی لە سەر زاری خەڵکی بەتەمەنیش لە چەند ناوچەیەکی باشووری کوردستان دەماودەم ماونەتەوە.

سەرەتایش بە دەستپێکی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەم دەست پێدەکەین:

**عەلی کەندی:** (لە ٢٨ـ٧ـ١٩١٤، هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهان، بە شێوەیەکی فەرمی ڕاگەیێندرا، لەلایەن وڵاتانی میحوەر و ڕوسیاو هاوپەیمانان، لەگەڵ ئەڵمانیا و ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیدا، ئەویش یەکەم: بە هۆی تیرۆرکردنی جێگری خاوەنشکۆی (نەمسا ـ مەژەر)، لە سرایڤۆو. دووەم: بەلێکترازانی پێوەندیی نێودەوڵەتی لەلایەك و بۆگەنبوونی ڕژێمەکانی ئەڵمانیا و عوسمانی لەلایەکی دیکەدا. بەتایبەتیش بە دامەزراندنی حکومەتی بۆرژوازی لە ڕوسیا و نەمانی توانای دەستەلاتی قەیسەری ڕووسیا لە سەر بارودۆخەکەدا و بەردەوامبوونی ئەم جەنگە تا ١١ـ١١ـ١٩١٨لە جیهاندا).

**سەید مەولود بێخاڵی:** (دوابەدوای ئەم تەنگەژەی سروشتی ڕۆژگار، لە ٢٨ـ٧ـ١٩١٤ زاینی، بە هۆی تیرۆرکردنی جێگری خاوەن شکۆی نەمسا، جەنگی یەکەمی جیهانی ڕاگەیێنرا، دژ بە ئەڵمانی و ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی، بە کۆتاییهێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دابڕینی جیهانی عەرەب لە عوسمانی و ئەڵمانەکان).

**نازەنین محمد وهبی و ئەوانی دیکە:** (کوردستان لە ماوەی ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانییدا (١٩١٤ ـ ١٩١٨ز): ماوەیەك بەر لە دەستپێکردنی جەنگ، لایەنە ڕکابەرەکان بە گەرمی کەوتبوونە خۆ و زانیارییان دەربارەی کوردستان کۆ دەکردەوە، هەر لە ژمارەی هۆزەکان و ژمارەی ئەندامەکانیانەوە، تا دەگەیشتە دابونەریت و جۆری چەکەکانیان و شوێنی جوگرافی و...بۆیە لە یەکەم ساتەکانی

شەڕەوە، هەروەك (لازاریف) دەڵێت: یەکەم تەقەی جەنگی یەکەمی جیهان لە خۆرهەڵاتی نزیکدا لە کوردستانی ئێران دەستی پێ کرد، هۆی ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان لەو دەڤەرەدا بە تەنیا هەڕەشەیان لە ڕێگای هیندستان نەدەکرد، کە بەریتانییەکان بەرژەوەندییەکانی خۆیان تیادا دەدۆزیەوە، بەڵکو هەڕەشەیان لە کێڵگە نەوتییەکانی باشووری کوردستان و کەنداویش دەکرد).

گەربێت و بەدواداچوون، بۆ بە دەستهێنانی زانیاری سەبارەت بە کورد و کوردستان لەو ڕۆژگارە ڕەشە بکرێ، ڕەنگە زانیاری باش و بایەخدارمان لە ئەرشیفخانەکانی دەوڵەتانی ئەورووپی و ئاسیایی دەست بکەوێت، کە تاکوو ئێستا خوێنەری کورد، پێی ئاشنا نەبووە.

**محمد ڕەسوول هاوار:** (ساتێك شەڕی جیهانی یەکەم دەستی پێکرد، کوردستان بوو بوو بە مەیدانی سوپای سێ وڵات، کە بریتی بوون: لە (عوسمانی و ڕووس و ئینگلیز) بە هۆی ئەوەوە کورد توشی کارەساتێکی گەورە بوو، بە بێ ئەوەی ئەو شەڕە هیچ سوودێکی کوردی تیادا بووبێ و میللەتەکەیی و وڵاتەکەی بە خۆڕایی ئالێنرایە شەڕەوە).

زووربەی ئەو جەنگانەی لە خۆرهەڵاتی ناوین ڕوویانداوە، کوردستان بووەتە گۆڕەپانی زۆرانبازیەکان و گەلی کورد تێوەگلاوە، بە بێ ئەوەی هیچ سودێکی بۆ کورد هەبووبێ، بەڵك و زیانی گیانی و ماڵی بەرکەوتووە.

**جەلیلی جەلیل و ئەوانی دیکە:** (گەلی کورد بوو بە یەکێك لە قوربانییەکانی ئەو کوشتارگە جیهانیانەی،کە (ئیمپریالیزم) بۆ دابەشکردنی جیهان ئەنجامیدان، هاوکات کوردستان و خاکەکانی دەوروبەری کە کورد تیایدا دەژیا ، بوون بە گۆڕەپانی شەڕی سەربازی ، لەلایەن سوپاکانی ڕوسیا و تورکیا و ئینگلتەرا،لەماوەی ئەو چوار ساڵەشدا ، شەڕی دەستەو یەخە ولاّتی نوقمی جۆگەلەی خوێن کرد و زیانێکی زۆری مادیشی بە دانیشتوان گەیاند ، هەر لایەنێکی شەڕکەریش هەوڵی ئەوەی دا کورد بقۆزێتەوە ، شانبەشانی گەلانی دیکەی ڕۆژهەلاّتی تورکیا و خۆراوای ئێران ، بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندیی خۆیان و لە دژی لایەنی دیکە و دوژمنانیان بەکاریان بهێنن،ئەوەش بووە هۆی نانەوەی ئاژاوە لە ناوچەکەدا،هەروەها بوو بە سەرچاوەی کارەسات و ماڵوێرانی بۆ دانیشتوان. هەرێمی کرماشان و کوردستان لە مەنجەڵێکی سەر ئاگر دەچێت).

**نەجمەدین شێخ کەریم:** (شەڕی یەکەمی جیهانی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ ساڵی برسیەتی و قاتوقڕی گەلی کورد لە ژێر ئەوسای هەیمەنەتی ئیمپراتۆری عوسمانیدا،لەژێر گوشاری دەستەلاّتی عوسمانی و سەفەوی، شەڕی یەکەمی جیهانی هەڵگیرساو خاکی کوردیش بێبەش نەبوو لەم شەڕەدا).

**محمد ئەمین زەکی:** (شەڕی گەورە(١٩١٤ـ١٩١٨)، پڕشکی ئاگری ئەو شەڕە گەورەیەش، وەکو شەڕانی پێشوی بەینی حکوومەتی عوسمانی و ڕووسیا، زوو لە هەموو شەڕەکانی پێشو بە شیدەتتر پەڕیە سەر ولاّتی کوردستان).

**محەمەد حەسەن سەرگەینێڵی**: (سوپای ڕووس کاتێ لە ١٩١٦ هاتە ئازربایجانی ئێران و لەوێشەوە بەرە و سنووری کوردستان کەوتەڕێ، بەو مەبەستەی داگیری بکەن و هێزی عوسمانی لەو ناوچەیە نەهێڵن، ئەوە بوو لە سێ قۆڵەوە هێرشی هێنایە سەر کوردستان : ١ـ قۆڵی شنۆ و حاجی ئۆمەران. ٢ـ سەردەشت و پشدەر. ٣ـ سەقز و بانە و پێنجوێن و شارەزور. لە قۆڵی سەردەشتەوە نەیتوانی پشدەر داگیر بکات. لە کاتێکدا سوپای ڕوس لە قۆڵی سەردەشتەوە هێرەش دەکات، پشدەریەکان بە هاوکاری (مەنگوڕ و بلْباس و ئاکۆ) بەرگریان کردووە، ئەو سوپایەیان ناچار کردووە بۆ دواوە بگەڕێتەوە).

**میر ئەحمەد میر**: (لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی، دۆڵی شاورێ لە ژێر دەستەلاّتی تورکاندا بوو، ڕووسەکان لە باکوور و ڕۆژهەلاّتەوە هێرەشیان هێنا، توورکەکانیش بە هاوکاری کوردەکانی ئەو سنوورە لە دژیان وەستابوونەوە).

**ڕەفیق حیلمی**: (حکومەتی ئینگلیز لە ساڵی (١٩١٤)، واتا لە سەرەتای شەڕی گەورەدا، لە جنوبی عێراقەوە دەستی کرد بە پەلاماردان بۆ سەر سنووری عێراق و لە (١٩١٥) دا بەسراو دوای ئەمە لە (١٩١٧) دا ویلایەتی بەغدای داگیر کرد، لە دوایەمین ساڵی ئەم شەڕەدا، ئیتر پێی نابووە ویلایەتی موسڵەوە).

سوپای بەریتانیا ـ ئینگلیز، لە مانگی ئایاری (١٩١٨)، گەیشتووەتە شاری کەرکوك.

**ئی.جەی.ئار**: (ڕووسەکان مانگێك زیاتر لە خانەقین بوون، بەلاّم لەبەر داهاتووی خۆیان و بێسەرەوبەرەیی لە ڕادە بەدەری سوپاکەیان، تا ڕادەیەکی زۆر

بوونە هۆی لە دەستدانی هاوسۆزی کوردان بۆ ئەوان و هاوپەیمانەکانیان. ڕووسەکان شارەکەیان لە نیساندا داگیرکرد، جا هەرچییەکیش بوو بێتە مایەی گومانی کوردان بەرامبەر بە ڕووسەکان، ڕێگەیان بە خۆیان نەدا بەرەنگارییان ببنەوە، لەبەر ئەوەی دەیانزانی ڕووسەکان وەکو هاوپەیمانیەك بە ڕەزامەندی بەریتانییەکان هاتوون، بەلاّم لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا هەواڵ گەیشت کە مامەڵە کردنیان لە گەڵ دانیشتواندا بووەتە مایەی ترس و تۆقاندن) .

ئەو ڕووداوانەی لە سەر دەستی سوپای ڕووس لە کوردستان ڕوویانداوە، زۆری نەخایەندووە، ئەوان لە ساڵی ١٩١٧ لە گەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ڕووسیا، لە کوردستان پاشەکشەیان کردووە.

**جەمال بابان:** (سەفەربەر و گرانی و قاتوقڕی شەڕی گەورەی یەکەمی گێتی کە هەڵگیرسا دەوڵەتی عوسمانیش خۆی دایە پاڵ ئەڵمانیا و بەوە خۆی تێوە گلاند. شاری سلێمانیش بەشێك بوو لە وڵاتی عوسمانی گەورەو فراوان پڕیشکی شەڕ، ئەو شارە بێ دەرەتانەشی گرتەوە).

**لازاریف. ن:** (گەلی کورد یەکێکە لە قوربانییەکانی، کارەساتی جەنگی یەکەمی جیهانی لە سەدەی بیستەم، (ئەوەی جێگای داخە ،ئەوەیە کە ئەو ڕاستییە بەشێوەیەکی فراوان ناسراو نییە). کوردستان و ناوچەکانی نزیك بوون لە شانۆی ئەو جەنگە سەربازیانەی کە مۆرکی پەلاماردان و هەڵهاتنی لەخۆ گرتبوو ،ناوچەکەی نوقمی لێشاوێك لە خوێن کرد. زەرەر و زیانێکی ماڵی زۆری گەیاند بە دانیشتوانەکەی. هەموو لایەنەکانی بەشەڕهاتوو، هەوڵیان دەدا کورد

و گەلانی تریش، لە ڕۆژهەلاتی تورکیا و ڕۆژئاوای ئێران بە کاربهێنن بۆ بەرژەوەندییەکانیان،کە ئەوەش بووە هۆی دروستبوونی ئاژاوە و پاشاگەردانییەکی تەواو لە ناوچەکە و بە هێزبوونی ململانێ ناوخۆییەکان لەسەر خاك و زەوی زاری ڕەگەزی،ئەم جەنگە کارەسات و بەدبەختی زۆری هێنا ،کە هەموو گەلانی ناوچەکە بە دەستیەوە دەیاننالاند).

**پەیسەر پرێس:** (لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، یەکەم تۆپ کە تەقێندراوە لە ڕۆژهەلات بەر کورد کەوتبوو. کوردستان یەکێك بوو لە قوربانیانی ئەم جەنگە، لە سالّی (١٩١٤ ـ ١٩١٨) زۆر بە توندی بەڕێوە دەچوو، لە گەلّ ئەوەشدا کوردەکان زۆر بە دلّسۆزی بەشداریی جەنگیان کرد و ولاتەکەیان بووە گۆڕەپانی جەنگ و شوێنی پێکدادانی لایەنە بە شەڕهاتووەکان، بەتایبەتیش لە بەرەکانی ڕۆژهەلاتدا، چونکە یەکەم تەقەی جەنگ کە کرا، لە باکووری کوردستان بوو).

**حەیدەر عەبدوللا:** (بەداخەوە گەلی کورد لە هەموو مەینەتێکی جیهانی بەشداری پێکراوە، لە هەموو خێر و خۆشییەکیش پەراوێز خراوە، لە گرانیی گەورەیش پشکی شێری بەرکەوتووە و قوربانییەکی زۆری داوە، دەولّەتە زلهێزەکانیش وەك عەزیا بەربوونەتە گیانیان... ڕاستییەکەی کوردەکان یەك مافیان هەبووە، ئەویش بێدەنگبوون بووە... کورد لە کارەستە دوژمنکردەکاندا چەوساوەتەوە و لە مەینەساتی خۆکردیشدا تواوەتەوە).

**شادمان مەلا حەسەن:** (دەولّەتی عوسمانی دوای دوو مانگ لە هەلّگیرسانی جەنگ، ئەویش ڕۆژی ٣/١٠/١٩١٤ چووە ناو جەنگ دژی هاوپەیمانان، لە پالّ

ئەڵمانیا و نەمسا. ئەو سوپایانەی کە لە کوردستان بوون، هۆکارەکانی گواستنەوە و خۆراکیان زۆر کەم بوو بۆیە بە تەواوی بوون بە بارگرانی لە سەر خەڵکی کوردستان، جەنگ تەواوی کوردستانی گرتەوە، سوپای ڕووسیا لە ڕۆژهەڵات و باکورەوە هاتنە ناو خاکی کوردستان، تاکو گەیشتنە زۆر شوێنی وەکو(خانەقین و پێنجوێن و ڕواندزو ئاگری و قارس)، لە باشوورەوە سوپای ئینگلیز و لە ڕۆژئاواش سوپای فەڕەنسا، کوردستان بووە مەیدانی شەڕێك، کەوا هیچی کوردی تێدا نەبوو، تەنانەت کوردستانی فارسی دەوڵەتەکەی نەچووبووە ناو شەڕەوە، بەڵام هەرسێ سوپای ڕووسی و عوسمانی و بەریتانی لە سەر خاکەکەی جەنگیان هەڵگیرساند. لە جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤ ـ ١٩١٨) کوردستانی فارسی کە ڕۆژهەڵاتی ئێستایە، بووە مەیدانی جەنگ، کوردەکانی ئەوێ بەسەر دوو مەزهەبە سەرەکییەکەی ئیسلام دابەش بوونە، باشوورەکەی لە شیعەن و باکورەکەی سونەن، دەوڵەتی قاجەری نەچووە ناو شەڕ، بەڵام سوپای عوسمانی و ڕووسی، لە باکوورەوە هاتنە ناوەوە، سوپای بەریتانیان لە باشوورەوە، کوردە سونەکان لە خوتوخۆڕایی، هاوسۆزی عوسمانی بوون، گوایە ئیسلامی سوننە مەزهەب و خەلیفەی موسڵمانانە و جیهاد دەکەن، کوردە شیعەکان زیاتر هاوسۆزی بەریتانیا و هەتا ڕادەیەکیش ڕووسیان پێ باشتر بوو لە عوسمانی، بەبێ ئەوەی بیر لە خۆیان بکەنەوە، بەئاراستەیەك کەوا قەوارەیەك بۆ خۆیان دابنێن) .

**فازڵ هاودیانی:** (شەڕی جیهانی یەکەم ساڵی (١٩١٤) کە دەستی پێکرد، ئەو کات خەڵك ناوە ناوە گوێیان لە هەواڵی گرانی و قات و قڕی دەبوو، کە ماڵوێرانی بە دوای خۆیدا دەهێنێت) .

## پەراوێز:

نی.جەی.نار، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی) لاپەڕە(١٥).

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان)، گۆگڵ، ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١ .

جەلیلی جەلیل، م.س.لازاریف ، م.ا.حەسرەتیان، شاکرۆ محۆیان، نۆلگا جیگالینا، (شۆڕشەکانی کورد لە سەردەمی نوێدا) لاپەڕەکانی (١٣٥ و ١٤٦).

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەم)، لاپەڕە(١٧٩).

رفیق حلمی، (یاداشت)، بەشی یەکەم لاپەڕە(٢٩).

سەید مەولود بێخاڵی، (هەولێرم وا دیوەو....) بەرگی چوارەم،لاپەڕە(١٣٣).

شادمان مەلا حەسەن، (کورد لە جەنگی جیهانی یەکەم + کورد بە دوای سەرابدا وێڵە)، فەیسبوک، لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

عەلی کەندی، (ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە)،لاپەڕە (٩٧).

فازڵ هاودیانی، (هاودیان)،لاپەڕەکانی (٢٩ ـ ٣٠).

لازاریف.ن، (مێژووی کوردستان)،لاپەڕە (٢٩٣)

محمد رسول هاوار، (کورد و باکوری کوردستان) لاپەڕە (٥٤١).

محمد ئەمین زەکی، (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان)، لاپەڕە(١٧٧).

م . محەمەد حەسەن سەرگەینێلی، (هۆزی ئاکۆ) لاپەڕە (٣٩٨).

مێی ئەحمەد مێی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/١/٦ لە گوندی سۆرەبنەی نزیك قەڵا سەید.

نازەنین محمد وهبی، عەتا عەبدوللا معروف، دارا محمد عبدولا، (مێژووی نوێ و هاوچەرخ ـ بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی)،لاپەڕە(١١٤ ـ ١١٥).

نەجمەدین شێخ کەریم، (شەڕی جیهانی یەکەم ١٩١٤ ـ ١٩١٨ ز)، فەیسبوك، گۆڤاری (k٢١) لاپەڕە (٦٧).

## کۆمەڵێك هۆكار بوونە هۆی سەرهەڵدانی گرانیی گەورە لە کوردستاندا...

### یەکەم: بـــــاج

وەرگرتنی باج لەلایەن دەستەلاتەوە لە هاولاتیانی سنووری دەستەلاتەکەی خۆیدا، کارێکی لە مێژینەیە، بابزانین لە سەردەمی گرانیی گەورەدا، دەستەلاتدارانی کوردستان، چ جۆرە باجێکیان لە خەڵکی کوردستان وەرگرتووە یان ستاندووە، شێوە و بڕی ستاندنی باج چۆن و چەند بووە و باجیان خستووەتە سەرچی؟! .

**جەمال بابان:** (باج سەندن بە جۆرێك پەرەی سەند، هەموو شتێکی گرتەوە).

**پەیسەر پرێس:** (باجی جەنگی کە لە سەر هەموو شتێکی هاولاتیان دانرابوو، بووە هۆی دەرکەوتنی دیاریدەیەکی دیکەی کۆمەلایەتی، کە بریتی بوو لە سەرهەڵدانی چەند کەسێك و هەستان بە پەیوەندی دروستکردن، لەگەڵ بەرپرسانی عوسمانی و ئەوەش بۆ ئەوەی ئەوانیش سوودێك ببینن، لەو ڕێگایەشەوە ئەوەندەی تر، بارقورسی بۆ هاوولاتیانی ڕەشوڕوت و کەم دەرامەت بوو، بە جۆرێك لە هەندێك شوێندا، هاوکاری کردنی جەنگیان گەیاندووەتە ٥٠٪ی سامانی کەسەکان، یان داهاتی ئەو کەسانە،ئەم باجانەش بە زۆر بووە و هەر کەس

نەیدابێت یان خۆی دزیبێتەوە، ڕوو بە ڕووی توندترین سزا بووەتەوە. بۆ هەموو موڵك وماڵێکی نەگوازراویش، بە ڕێژەی ٢٥٪ باجیان لە سەر دانابوو. لێرەدا ئەوەی زەرەرمەندی یەکەم بوو،لە باج و سەرانە و سەربازپێدان بە دەوڵەتی عوسمانی، گەلی کورد بوو. بەپێی یاسای عوسمانییەکان، دەبوو هەموو هاوڵاتییەك(١٠/١)ی بەرهەمی کشتوکاڵی خۆی بە بێ بەرامبەر بداتە سوپای عوسمانی. کاتێك سوپای عوسمانی تووشی برسیەتی زیاتر بوونەوە، (١٠/١)ی تریشیان زیاد کرد ،واتا کردیانە دە بەرامبەر).

ئەوانەی باجیان نەداوەو بەرهەڵستی بڕیارەکانی دەوڵەتیان کردووە، ڕووبەڕووی سزای قورس بوونەتەوە.

**محمد ڕەسول هاوار:** (دەربارەی ئەو باج سەندنە، ڕۆژنامەی قەفقازی ژمارە (٨٤) ساڵی ١٩١٤، باسی ئەوەی کردووە چۆن تورکەکان لە دوای شەڕی بەلقان، لەجیاتی ئەوەی بەباشی لەگەڵ کوردا ڕەفتار بکەن، دەستیان کردووە بە زۆر کردنی باج و کار گەیشتە ڕادەیەك باج لە منداڵیش دەستێنراو هەر کاربەدەستە بە شێوەیەك و بە ئارەزوی خۆی باجی دەسەند. هەروەکو (چێرکۆف) لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی ڕوسیا، لە ساڵی ١٩١٤دا باسی کردووە، ئیتر کورد لە وزەیدا نەمابوو، بڕیاریاندا باج نەدەن بە حکومەت و ئەوانەی لە بەدلیسەوە نێررابوون بۆ مۆرکی و خوبود دەرکران. پەیامنێرە ئەوروپییەکان باسی کوردەکانی (ترایر و دیاربەکر و موسڵ و ناوچەکانی تر) یان کردووە چۆن بڕیاریاندابوو باج نەدەن بە حکومەت و لە بایەزید بەرەنگاری هێزەکانی حکومەت بوونەوە. لە حوزەیرانی

(١٩١٤) دا، لە قەزای (موتکی و غرزان)، لەسەر نەدانی باج شەڕێکی قورس قەوما پاش ئەوەی تورکەکان لە جیاتی باج مەڕومەڵاتیان بە زۆر زەوت دەکرد و لە بازاڕی بەدلیسدا بە ئارەزووی خۆیان دەیان فرۆشت. کوردەکان پێکەوە بێزاریی خۆیان دەربڕیبوو، دژی ئەو باج و سەرانە زۆرانەی پشتی میللەتی کوردیان شکاندبوو. دەوڵەمەندەکانیش کەوتنە ژێر باجێکی زۆری حکوومەتەوە کە پێی دەگوترا (بەدەلی عەسکەری)، بۆ ئەوەی نەکرێن بە سەرباز و حکوومەت گەلێك شێوەی تری بەکاردەهێنا بۆ پارە سەندن لە خەڵك، کە بۆ هەر جۆرێك بڕوبیانویەکی ئەدۆزیەوە، لەگەڵ لێستاندنی ولاّغە بەرزە، بە بیانوی ئەوەی خۆراك و ئازوقەیان پێ دەگوێزنەوە بۆ ناوچەکانی شەڕ و لە کوردستانا هی وای تیا نەمابوو توانای کشتوکاڵکردن و بەرهەمهێنانی مابێ).

ئەوەی ولاّغە بەرزەی هەبوایە، دەبوو خۆی و ولاّغەکەی چەند جارێك بە بێ کرێ سەرباز و کەلوپەلی سەربازی و خۆراك لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر بگوازێتەوە، ئەوەندەی سوغرە کێشی بکات، جار وابووە خۆی یان ولاّغەکەی فەوتاوە.

**سمایلی مەلای نورەدینی:** (دیکۆمێنتی مێژوویی قۆچانە.. مەڕانە، کاتێ کە عوسمانییەکان جڵەوی خەلافەتی ولاّتە ئیسلامییەکانیان گرتە دەست،بەناوی زەکات بۆ خەلافەتی ئیسلامی،باجی ساڵانەی(مەڕ و ماڵات،دانەوێڵە،میوەجات) یان دەخستە سەر داهاتی خەڵکی ژێردەستەلاّتیان. ئەمەی خوارەوەش پسولەیەکی ڕەسمی سەردەمی (سوڵتان عەبدولحەمید)ە، کە بەڵگەیەکی مێژووییەو

دەیسەلمێنێ کەلە کوێستانی (گۆڕپەنانی) گوندی (زەنگلاَن) ی بەری ئاکۆیەتی، ناوچەی پشدەر ، قۆچانەی مەڕ و بزن و مالاَتیان ستاندووە).

لە بەشی پاشکۆی وێنەکاندا، پسوولەکە دەخەینە ڕوو، هەرچەندە نووسینەکەی بە ڕوونی دیار نییە.

**میر ئەحمەد میر:** (مەئموری عوسمانیەکان کە تەحسیل داری پێ گوتراوە، بە سواری ولاَخ دوو تا سێ جندرمەی لەگەلّ بوون و هاتووەتە سەر جۆخینەکانی دۆلّی شاورێ و تەحسیلدارەکە باجی زۆری لە سەر جۆخینەکانمان داناوە، لە هەموو بیتوێن و دۆلّی شاورێ و دۆلّی بالّەکایەتی گەڕاون و باجیان لە سەر زۆر شت داناوە).

تەحسیلدار، قۆرچی و باج ستێنیشی پێ گوتراوە، ئاژەلّی خەلّکیان ژماردون و بە زۆر قۆچانەیان لێ ستاندون) .

**دارا بەکر گردگۆزانی و عەزیز قادر بێناتانی و عەزیز عەبدوللاَ چیوەیی:** (جندرمەکانی تورك گوند بە گوندی خۆشناوەتی گەڕاون و باجێکیان لە کەسانی قەلّەو ستاندووە، بەبیانوی ئەوەی لەکاتی دانیشتندا ڕووبەرێکی زۆر لە زەوی دەگرن، ئەویش (سمتانە ـ قونانە)ی پێ گوتراوە).

**قادر ئەحمەد مەرگەیی:** (جندرمەکانی تورك هاتونەتە بەری مەرگە و باجی سمتانەیان لە خەلّکی گوندەکانی ناوچەکە ستاندووە).

**دارا بەکر گردگۆزانی:** (بەشێك لە چەکدارەکانی تورك پێیان گوتراوە (جندرمە)، هەندێکیشیان پێیان گوتراوە (زەبتیە)، بارەگایەکی سەرەکییان لە گوندی (کۆلکەڕەش) لە نزیك گوندی (هێران ) بووە، زۆر توند و تیژ بوون، چەند کوردێکیش سەر بە ئەوان بوون، ئەو کوردانە لەلایەن تورکانەوە کرابوونە (قارس)، بە مەبەستی وەرگرتنی ڕەزانە، ئەگەر ڕەزێك دوو (قەتارە) ترێیی، بەرهەمی ساڵێك بوایە، بەچوار قەتارە ترێ خەملاندویانە !) .

لە پەڕتوکی (خۆشناوەتی لە سەدەی بیستەمدا ـ بەرگی یەکەم)، لە باسی گوندی (دواوێ)، نمونەیەکی لە هەمان شێوە، تۆمارکراوە. باج ستێنەکان چەند باجێکی تریان لە خەڵکی ستاندون، بۆ نمونە: ئاشانە و جووتانە و ...هیتد.

**حەمەد ئاغیلە بێراوەیی:** (باجێکی تریش هەبووە بەناوی (سەوزانە)، وە گوێم لە (خەجیج) ی نەنکم بوو دەیگێڕایەوە: (کاتێ تورك لێرە دەستەلاتداربوون، ڕۆژێك (خدر)ی کوڕم لەلای بزنەکانی بوو، لە خوارووی گوندەکەمان سەرقاڵی لەوەڕاندنیان بوو، کوڕێکی تریشی لەلا بوو بە ناوی (عەبدوڵڵا)، ئەویش شوانی بزنەکانی خۆی بوو، لەوکاتەدا چەند (جندرمە) یەکی تورك چووبوونە لای ئەوان، بە مەبەستی وەرگرتنی قۆچانە، کاتێ جندرمەکانیان بینی بوو، (عەبدوڵڵا) هەڵهاتبوو، (خدر)یان کەوتبۆ دەست و زۆریان لێدا بوو، دواتر جندرمەکان بەرەو گوندەکە هاتن و (خدر) یان خستە نێو (ئاخوڕ) ی چێر (مانگا)ان، لە تۆڵەی ئەوەی ناوو شوێنی شوانەکانی تری پێ نەگوتبوون. کاتێ

هاتنە ناو گوندەکە باجی (سەوزانە و قۆچانە و ڕەزانە و ..هیتر) لەخەڵکی گوندەکە ستاند).

سەرەڕای لێستاندنی باج، جووتیار و ئاژەڵدارەکان دەبوایە (ئاغا و کوێخا و شێخ و مەلا و فەقێ)یەکانیش ڕازی بکەن بە پێدانی بڕێك لە بەروبوومی ئاژەڵ و کشتوکاڵەکانیان. لە کتێبی (خۆشناوەتی لە سەدەی بیستەم ـ بەرگی یەکەم)، باسی چەند باجێك لەو باجانە کراوە، کە جندرمەکانی تورك لە خەڵکی خۆشناوەتییان ستاندووە.

## پەراوێز:

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان ...)، گۆگڵ، ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١ .

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەکە) ،لاپەڕە (٥٢).

حەمەد ناغیلە حەوێز، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/٩/٢٦ لە گوندی بێراوە.

دارا بەکر سەلیم ، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٨/٢٤ لە شارۆچکەی چوارقوڕنە.

سمایلی مەلای نورەدینی، بلاّوکراوەی شەشارە، ژمارە(٠)، لاپەڕە(٥).

عەزیز عەبدولاّ عەلی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٦/٨ لە گوندی (چیوەی سەروو).

عەزیز قادر عەبدولاّ، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٤/٢٧ لە گوندی وەرێ.

قادر ئەحمەد فەرەج مەحمود، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٥/٢٤ لە هۆبەی کشتوکاڵی سەروچاوە.

محمد رسول هاوار، پەرتوکی (کورد و باکوری کوردستان)لاپەڕەکانی(٣٧١ و ٣٧٨ و ٤٢٤ و ٥٤٧).

میر ئەحمەد میرە، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/١/٦ گوندی سۆرەبنەی نزیك قەلاّ سەیدی دۆڵی شاورێ.

## دووەم: قاتی و بەرزبوونەوەی نرخ

چەند بارودۆخێك هەن، دەبنە هۆی کەمبوونەوەی خۆراك و بەرزبوونەوەی نرخ، بۆ نموونە: جەنگ، ئەگەر ماوەیەك بەردەوام بێت، قاتوقڕی بە دوادا دێت و خەڵکی دووچاری ماڵوێرانی و ڕووداوی جۆراوجۆر دەبن.

**ڕەفیق حیلمی:** (بێ ڕووحی و بەزەیی پیانەهاتنەوەی تەبیعەت، بەفەقیر و هەژارا لەلایەك و ناپاکی و زەبروزەنگی کاربەدەستە خوانەناسەکان لەلایەکی ترەوە، بوون بە هۆی قاتوقڕیەکی بێ دادو ماڵ وێرانکەر، بەجۆرێك کە هۆقەیەك ئاردی تێکەڵ و پڕ لە خاکوخۆڵ، چووە لیرەیەك، بە قەدرایی چەند مانگێك بێجگە لەوانەی کە دەوڵەمەند و دەستەڵاتداربوون، وەیا لە حکوومەت مەواجب و ئازوقەیان وەردەگرت، ئەو دوای ئەهالی کەوتنە، سەخڵەتی و تەنگانەیەکی وا کە ئیتر مەپرسە! بۆ خواردن ئاردەبرنج، مێوژی ڕەش، تووی وشك، تەواو بوو دەست نەدەکەوت، ئینجا کەوتنە خواردنی ئاردی بەڕوو، پەمووودانەش بوو بە خواردنی دەوری هەرە نەگبەتی و لێقەوماوی فەقیر و هەژاری لیوای سلێمانی) .

**ممدوح مزووری:** (لەپاییزی ساڵی ۱۹۱۷ تا بەهاری ساڵی ۱۹۱۸ قاتیەکی زۆر توند لە ولاتی ڕواندز هاتەوە، بەلکە لەهەموو کوردستان هاتەوە. ئازوقەو دەغڵ و دان لەولات نەما، بەهیچ بارێك پەیدا نەدەبوو. ئەمەو هۆی ئەم قاتیە شەری جیهانی یەکەم بوو).

**تاهیر احمد حەویزی:** (لە زستانێ گرانی دەستی پێ کرد ،لە بەهاری (١٩١٨) شدەتی سەند ، لەم دوو کژە زۆر کەس فەوتان، کێلەی گەنمی (٦٠) کیلۆ، گەشتە (٢٧) قران، کۆتکی ئاردی بووە (٢) لیرە. نرخی گەنم و جۆ لە پێش حەربی عەلبەی کۆیە بە (٤٠) ڕوپیەو (٢٤) ڕوپیە بوو، بەلاّم لە سالّی (١٩١٨)، گەیشتە (١٥٠٠) ڕوپیە و (١٢٠٠) ڕوپیە) .

**پەیسەر پرێس:** (بەرزبوونەوەی نرخی دانەوێلە بە شێوەی چاوەڕواننەکراو بەرز بووەهەر بۆیە ژمارەیەك بازرگان کە دەستیان لەگەڵ بەرپرسانی عوسمانی لە ناوچەکەدا تێکەڵ کردبوو،دەستیان دابوویە بازرگانیکردن بەو بڕە دانەوێلەیەشەیەوە کە دەردەچوون و دەیانبردە دەرەوە لەبەر ئەوەی بڕێك داهاتی باشتریان دەست بکەوێت، لە هەمان کاتیشدا هەندێك لە خاوەن هێز و خێڵەکانی ناوچەکەدا دەستیان بەسەر شتێکدا دەگرت و بۆ خۆیان قۆرخیان دەکرد وەك ئەوەی عەشیرەتی شەمەر دەستیان بەسەر بازرگانی هێنان و بردنی خۆیدا گرت. برسیەتی سەرجەم شاری موسلی گرتەوە و لە هەمان کاتدا ئەو ساڵە بە ساڵی(لیرەی بە بەها)ناو بانگی هەیە،چونکە بە شێوەیەکی بەرچاو نرخی شمەك و کالاکان بەرزبووەوە،تا کار گەیشتە ئەوەی بڕێکی دیاریکراوی گەنم گەیشتە یەك لیرەی ئالتون. دەوڵەمەندەکانی موسڵ هەستان بە فرۆشتنی دەفرە زیوەکانیان تاوەکو پێی بژین. نرخی شتومەك ئەوەندە بەرز ببوویەوە کەس چاوەڕێی نەدەکرد ،نرخی گەنم بە ڕێژەی ٢٦٠٪ و برنج ٢٥٠٪ و جۆ ١٦٠٪ و شەکر و چا سێ بەرامبەر بەرز بووبوویەوە).

دەوڵەمەندەکان خشڵ و کەلوپەلی گرانبەهایان هەبووە، خۆراکیان پێ کڕیوە گەر دەستیان کەوتبێت، لە هەمان کاتدا هەژارەکان نە خشڵ، نە کەلوپەلی گرانبەها، نەخۆراکیان هەبووە، لە دۆخێکی یەکجار سەختدا بوون...

**حوسێن ڕابی:** (کاربەدەستانی حکوومەتی گەندەڵ و دواکەوتووی قاجەرەکان، نە تەنها یارمەتی خەڵکیان نەدەدا، بەڵکو بە هەلیان دەزانی کالاکان ئیحتیکار بکەن، بۆ ئەوەی بە گرانتر بیفرۆشنەوە).

کەواتە حکومەتی ئەوکاتی ئێرانیش، دەستی هەبووە لە بلاوبوونەوەی گرانی و برسیەتی...

**محمد ئەمین زەکی:** (حۆقەی ئارد گەیشتە لیرەیەکی زەرد، مەئموورینی مەنزڵ زوڵمێکی فەوقلعادەیان کرد، ئۆردو بەبێ تەدبیری و سوئی ئیستعمالاتی خۆی، کە ڕێگەی هاتنی زەخیرەی لە دیهاتانەوە بڕی و لە دوایدا زەخیرەی ماڵانی زەوت کردەوە خەڵکە مەزلوومەکە هیچیان بە دەستەوە نەماوەنیهایەت سەدا(٧٠)لەبرسانا مرد. لەپەراوێزی هەمان لاپەڕە نووسراوە: وەکو ئەگێڕنەوە مەنزل ئەو زەخیرەیەی کە بە زۆر لە ئەهالی ئەسەند بە دزیەوە بە پارە ئەیفرۆشتەوە، بەم تەرحە لە سەر ئەجسادی مەزوڵیمن و مەعسومین تیجارەتیان ئەکرد).

**فەقێ علی مدریس پێنجوێنی:** سوپای عوسمانی گشت زەخیرە و سامانی کوردستانی وێران کردبوو، تالانی کردبوو، دەرەنجامی ئەو کردارە، گرانییەکی گەورە ڕوویدابوو، داپیرم بە ناوی (ئاسیا خان)، بەو شێوەیە دەیگێڕایەوە:

(تەمەنم نزیکی ٨ ـ ٩ ساڵان بوو، کە گرانییەکە ڕوویدا، بەڕادەیەك پارچە نانێك، لە قەڵای هەولێر و دەوروبەری، بە یەك لیرەی ڕەشادی بوو) .

**عومەر فەقێ ئەحمەد شێخوەسانی:** (لەو کاتەدا چەند خێزانێك لە خۆشناوەتی،هەر یەکێك پڕ بە چەند بێژینگێك،لیرەی ئاڵتوونییان هەبووە، بەڵام خۆراك دەست نەکەوتووە) .

لە بارودۆخێکدا کە خۆراك نەبێت یان دەست نەکەوێت، پارە هیچ بەهایەکی نامێنێت...

**پەراوێز:**

پەیسەر پرێس، گۆڤارێکی سیاسی گشتییە ،لە گۆگڵ، ژمارەی ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١ بە ناونیشانی (گرانیە گەورەکەی کوردستان ...) .

تاهیر احمد حەویزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم،لاپەڕە(١٣١ و ١٣٢).

رفیق حلمی، یاداشت بەشی یەکەم،لاپەڕە(٣٠).

فەتحی علی مدریس بێتواتی: لە ڕۆژی ٢٠٢٠/٤/٢٥، زانیاریەکانی لە ڕێی فایبەرەوە بە دەستنوس بۆ ناردم.

مدوح مزووری، (مێژووی ڕواندز) لاپەڕەکانی (٢٨٨ و ٢٨٩).

محمد ئەمین زەکی، (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان)بەرگی یەکەم و دووەم،لاپەڕە (١٨٠).

عومەر فەقێ ئەحمەد، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/١٥ لە بالیسان.

حوسێن ڕایی، لاپەڕەی تایبەتی خۆی لە فەیس بوك، (٤)ی سپتمبری (٢٠١٨) بە ناونیشانی (جەنگی یەکەمی جیهانیدا).

## سێهەم: زەوتکردن، لەناوبردن، تالآن کردن

لە سەردەمی گرانییەکە و پێشتر و بۆ ماوەیەك دواتریش، بژێوی زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی کوردستان بە تایبەتی گەلی کورد، لە سەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بوو، بە زەحمەت و ئەزیەتێکی زۆریشەوە، هەر خێزانێك خانوویەکی بچووکی بۆ دروست دەکرا .

**ئازەنین محمد وەهبی و ئەوانی دیکە:** (عوسمانییەکان و ڕووسەکان و ئینگلیزەکان و ئەڵمانییەکان و ئێرانییەکان، بەهۆکاری سەرەکی سەرجەم ئەو کارەساتانە دادەنرێن، هەرچەندە عوسمانییەکان و ڕووسەکان ڕۆڵی سەرەکییان هەبوو لەم بوارەدا. بەم جۆرە بەشی کوردستان بە درێژایی ڕۆژانی جەنگ، هەر کاولکاری و تالآنکردن و سووتاندن و کوشتن و بڕین بوو).

**جەلیلی جەلیل و ئەوانی دیکە:** (دەستەلآتی تورکیا لە ساتەکانی شەڕدا،لە ئەرمەنستانی ڕۆژئاوا کوردستان پێشڕەوی بکردایە وەك بڵێی لە خاکی دەوڵەتێکی دوژمندایە بۆیە دەستی کرد بە تالآنکردنی ئازوقە و مالآتی هاوولآتیان،دانیشتوانیش لە ناخەوە هەستیان بە توڕەیی و بێزاری دەکرد،چونکە لە جیاتی ئەو ئازوقەیەی دەستی بە سەردا گیرا،یان پارەیان وەردەگرت، کە نرخەکەی لە مامەڵەکردندا زۆر دابەزیبوو،یان پسوولەیان وەردەگرت، کە دواتر خەرج نەدەکرا.لە کۆتایی ساڵی(١٩١٥)سوپای ڕوسیا لە قەفقاس، هێرشێکی

دەستپێکرد و لە ساڵی(١٩١٦)بە قوڵایی(٢٥)کیلۆمەتر چووە ناو خاکەکەیەوە،لە ئاکامدا دەستی بە سەر بەشێکی زۆری ئەرمەنستانی ڕۆژئاواو کوردستاندا گرت،دانیشتوانی ئەو ناوچانەش لەوانەش کورد،زیانێکی زۆری گیانی و ماڵییان لێکەوت، هەرچەندە کورد،چ ئەوانەی لە سوپای تورکیادا بوون،یان لە دانیشتوانی سڤیل بوون،بە هیچ شێوەیەك بەرهەڵستی چالاکیانەیان بەرامبەر سوپای هێرشبەری ڕوسیا ئەنجام نەدا. بارودۆخەکە لە سەرتاسەری، ناوچەکانی کوردی ژێر دەستەلاتی حوکمی تورکیا تراژیدی بوو، دانیشتوان نەیانتوانی تا دوو ساڵ بەروبومەکانیان بدرونەوە و مێگەلە مەڕەکانیشیان بۆ لەوەڕ ببەنە شاخەکان، ئەمەش بووە هۆی زیان لێکەوتنی ماددیی کوردی شارنشین و ڕەوەند بە گشتی، بۆیە دوچاری مەترسی برسییەتی بوونەوە) .

سوپای ڕووس و عوسمانی، لە هەندێك شوێندا، کە پاشەکشەیان کردووە یان هەڵاتوون، فریای بەتاڵانبردنی خۆراك و کەلوپەلی ماڵان نەکەوتوون، خواردنەکەیان ڕشتووە و خەساریان کردووە، بەو مەبەستەی سوپای دووژمن کە کەیشتە شوێنی ئەوان، سود لەو خواردن و خۆراك و پێداویستیانە نەبینێت...

ئی.جەی.ئارپ: (ساڵی (١٩١٦) هێزێکی سۆراخکردنی ڕووس، ئەوەندە خۆی کشاندە باشوور، تا گەیشتەخانەقین و لە ماوەی دوو سعاتدا، شارەکەی تاڵانکرد. دەرکەوت ناوچەکە لە ڕەواندوز، بە هۆی لێشاوی یەك لە دوای یەکی هاتنە پێشەوەی ڕوس و تورکەوە، کە وڵاتی کردبوو بە چۆڵەوانییەکی زۆر بەرچاو. ناوچەکانی دەوروبەریش، کشتوکاڵی لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا، بەتەواوی

تیادا وەستێنرابوو. ڕژێمی ڕووسەکان تەنانەت لە هی تورکەکان بێ بەزەیی ترە. دانیشتوان لە ولاَتی ئێران هەرگیز ئەوەندە دەستدرێژییان نەکراوەتە سەر، بەلاَم کوردانی تورکیا وەکو دوژمنێك ڕەفتاریان لە گەلّدا کراوە و هەموو چینەکانی کۆمەڵیش،بەبێ جیاوازی تالاَن کراون. گوندەکان لە مێگەل و گاگەل ڕووتکرابوونەوە، بە بڕی زۆریش لە سنور ئاودیو کرابوون، گشت دانەوێڵەکانی دەوری خانەقین، بە بێ ئەوەی حەقەکەیان بدرێ، بردرابوون و لەناوبرابوون. ڕووسەکان بەردەوام داوای خۆراکیان دەکرد، سەرەڕای ئەوەی کە کارەکەیان ئەوەندە قورس کردبوو، خەڵك نەتوانن خواردنیان بۆ دابین بکەن. نانی گەنم لە ئەنجامی ئەوەدا دەست نەدەکەوت، جگە لە دەوڵەمەندەکان، خەڵك هەمووی بێ دەرامەت و دەست کورت بوون. کوردەکان تێگەیشتون، بونی ڕووسەکان شتێکی پێویستە، بەلاَم لێمان پاڕانەوە زۆر لە ڕووسەکان بکەین، کۆتایی بە تالاَنی و توندوتیژی بێنن و بە جۆرێك بجوڵێننەوە کە لە سوپایەکی پێشکەوتووی داگیرکەر بوەشێتەوە. زانیاری زیاترمان بە دەست گەیشت، لەو بارەیەوە کە خانەقین ساف لە ساف تالاَن کراوەو زۆربەی تالاَنکاری بە درێژایی سەر سنورەکان دەکرێ. لەباسی شکان و دەرپەڕاندنی ئاسوریەکان و نەستوریەکان لە ورمێ لە لایەن ئەرمەنەکان، دەڵێت: کاتی کشانەوەیان لە ورمێ بۆ هەمەدان، زۆر بە توندی لەلایەن کوردەکانەوە هەراسان کرابوون، ئەمەیش بێ مەلاَمەت نەبوو، بەڵك و لەبەر ئەوەی کاتی کشانەوەیان لە هەرکوێ بکرایەو بە ناو هەر خێڵێکدا تێ بپەڕینایە، گوندەکانیان تالاَن دەکرد و هەموو جۆرە کردەوەیەکی ناپەسند و تاوانبارانەیان ئەنجام دەدا).

ئی.جەی. ئارِ، خۆی لە نێو ڕووداوەکاندا بووە، ئەو بەرپرسێکی سەربازی پلە بالآی ئینگلیز بووە، ئینگلیزەکان و ڕووسەکان لەو جەنگەدا هاوپەیمان بوون، کوردەکان داوایان لە ئینگلیزەکان کردووە، کارێکی وا بکەن کە ڕووسە هاوپەیمانەکانیان واز لە تالآنکردن و توندو تیژی دژی کوردەکان بهێنن.

**مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی:** (لەساڵی (١٩١٦) لەسەردەستی سەربازەکانی ڕووسیای تزاری، ڕەزو باخ و شینایی دەوروبەری ڕواندز بە یەکجاری سوتا) .

بەشێکی زۆری خەڵکی ڕواندز و دەوروبەری، بژێوی ژیانیان لە سەر بەروبوومی کشتوکاڵ بووە.

**سەردار عبدالرحمان شێخوەسانی:** (جەندرمەکانی تورك بەسواری ولآغە بەرزە، لە گوندەکان گەڕاون و دانەوێڵە و کەلوپەلە بەنرخەکانی خەڵکی گوندەکانیان بەتالآن بردووە، باس لەوە دەکرێت، ئەو دانەوێلآنەی خەڵکەکە لە نێو کدولانیشدا شاردبوونیانەوە، ئەویشیان بردووە ! ئەو خۆراك و کەل و پەلانەی پێیان نەبردراون، بە قاچی وولآغەکانیان شێلاویانن) ! .

چەند سەربازێکی سوپای ڕووس هەڵیان کوتاوەتە سەر گوندی شێخوەسانان و هەرچی خواردن هەبووە بە تالآنیان بردووەو خەڵکەکەیان ئەزیەتداوە. ئەوەش لە کتێبی (جوولەکەکانی کوردستان)، نووسینی (بەختیار محمدامین)، بە کورتی باسی لێوە کردووە.

**ڕەسوڵ حەسەن بالیسانی:** (لە کاتی گرانیەکەدا خەڵکی گوندی بالیسانی خۆشناوەتی، (کرمانج و بەگزادە) زوربەیان هەژار بوون، هۆکاری ئەو هەژاریەش زیاتر بەهۆی ستەمی تورکان بووە، چونکە تورکەکان دانەوێڵەی (کدولان) یشیان لێ ستاندبون) .

لێرەدا مەبەست لە کدولان، کدوی ئاوە، خەڵکی ئەو دەڤەرە دانەوێڵەکانیان لە نێو کدودا شاردووەتەوە، پێیان وابووە جندرمەکان شکیان بۆ کدو ناچێت کە دنەوێڵەی تیادا حەشاردراوە، هۆکارێکی تری شاردنەوە یان هەڵگرتنی دانەوێڵە لە ناو کدو دەکرێ بە هۆی کەمی دانەوێڵەکانیان بووبێت یان کەل و پەلی دروستکراوی وەکو ئێستا نەبووە کە دانەوێڵەی تیادا هەڵبگرن.

**محمد رسوول هاوار:** (دەربارەی هۆی بێزاربوونی کورد و ئەرمەنی بەرامبەر بە تورک: ساتێك کاربەدەستانی هێزەکانی تورك لە کاتی شەڕدا ،بەناو ئەرمەنی ڕۆژهەلات و کوردستاندا تێپەڕیان بکردایە ،هەموو خۆراك و مەڕوماڵاتی دانیشتوانیان تالان دەکرد و دەتورت بەناو خاکی دوژمندا تێدەپەڕن! ژنێك گەیشتبووە تینی و بە خۆی و منداڵەکانیەوە چووبووە بەر دەرگای دەزگایەکی حکوومەت و هاواری کردبوو هەمووومان بە زیندویی بنێژن،چونکە ئەوەی هەیبوو بۆ منداڵەکانی حکوومەت هەمووی بردووە بۆ خۆی و ئیتر منداڵەکانی بەچی گوزەران بکەن).

**قادر ئەحمەد مەرگەیی:** (خەڵکی بەری مەرگە ستەمی زۆریان لە دەست جندرمەکانی تورك بینیوە. جندرمەکان دانەوێڵە و خۆراکەکانی تریان لە خەڵکەکە ستاندووە و بردویانە و یان لەبەر چاوی خۆیان خەساریان کردووە).

**سەعید عەبدولا هەرتەلی:** (لەڕاستیدا چەند کەسێك لە (ئاغا و بەگ و کوێخا) کانی خۆشناوەتی و دەوروبەری، هاوکاری تورکانیان کردبوو، لە بەتاڵان بردنی ئاژەڵ و دانەوێڵە و سوتاندنی گوندی هەرتەلی خۆشناوەتی).

ووتەیەکی کوردی هەیە، دەڵێن: دارێك کرمی لە خۆی نەبێت، تەمەنی هەزار ساڵە.

**نەجمەدین شێخ کەریم:** (ئەم گەلە لە ژێر لافاوی هێرشی لەشکری ئینگلیز و تورك داهاتی کشتوکاڵ و بەروبومیان بۆ نەدەمایەوە تەنها ئەوان دەیان برد و دەرخواردی لەشکریان دەدا، بۆیە ئەو گەلە بێ خواردن و بێ زەخیرە دەمانەوە، ناوچەکەیان لە ژێر ئاگردا دەسوتاو کشتوکاڵیان بۆ نەدەکرا. بۆیە خواردنیان بریتی بوو لە گیاوگۆڵ. ئەمەش بەشێکە لە نەهامەتیەکانی گەلی کورد لە ژێر چەپۆکی داگیرکاری).

**ممدوح مزووری: (سوپای عوسمانی بەماڵاتی وەرکرد ئەوەی هەیان بو هەمویان بەزوری لێستاند و بۆ سوپا ڕەوانەی بەرەی شەڕیانکرد.ئەنجا خەلکەکە وەهاماوە بێ دەغڵ و دان) .**

**عەبدولا حەمەدەمین سەریکانی:** (دایکم ناوی (خەجیجە) بوو، دەیگێڕایەوە: لە گوندی سەریکانی خۆشناوەتی،لە ماڵەکەی خۆمان، لە قون ئاگردان

قۆرتافێکمان هەڵکەندبوو، هەندێك دانەوێڵەمان لە نێو (هەنبان)ێکی گچکە کردبوو، هەنبانەکەمان لە نێو قۆرتافەکەدا حەشاردا و دیوی سەرەوەمان بە قوڕ (سواق) دا، جندرمەکانی تورك هاتن، یەکێکیان شیشە ئاسنێکی لە دەستدابوو، شیشە ئاسنەکەی بست بە بست لە زەوی دەدا، کاتێك گەیشتە سەر (قۆرتاف ـ چاڵەکە)، شیشەکەی لێدا و تەپەی هات! زانیان کە دانەوێڵەی تیادایە بە خاکەناس هەڵیاندایەوە و هەنبانەکەیان برد).

دەکرێت تەنها ئەو هەنبانە دانەوێڵەیان هەبووبێت، ئاخۆ دواتر کەوتبنە چ بارودۆخێکەوە!

**هەلبەر حەمەد:** (پێش سەرهەڵدانی گرانیەکە، زۆربەی خەڵکی خۆشناوەتی دەوڵەمەند بوون، مەڕو ماڵات و دانەوێڵەی زۆریان هەبووە، عوسمانیەکان دەستیان بە ڕاوو ڕووت کردووە و ماڵ بە ماڵ گەڕاون، شیشە ئاسنێکیان پێ بووە، کە گەیشتوونەتە سەر چاڵە دانەوێلەکان دەنگێکی لێوە هاتووە، بەوە زانیویانە کە ژێرەوەی چاڵی دانەوێڵەیە و هەڵیانداوەتەوە و دانەوێلەکەیان بردووە، بەو هۆیەوە خەڵکی زۆر گوند کۆربوونەتەوە) .

بە پێی ئەو گێڕانەوەیە بێت، شیشە ئاسنەکە شیشەیەکی ئاسایی نەبووە، پێ دەچێت ئامێرێك بووبێت تایبەت بەو بوارە.

**فازڵ هاودیانی:** (دوای کشانەوەی لەشکری ڕووس، تورك هاتنە کوردستان، ئەوانیش برسی بوون، ئەوکات کوردەکان دەوڵەتی عوسمانییان بە خەلیفەی خۆیان

دەزانی، گەرچی تورکەکان بە دوای خواردن و تالاّن دەگەڕان، ماڵ بە ماڵ دەگەڕان بۆ پەیداکردنی گەنم و جۆ و ماش و نان).

پێش پەلامارەکانی ڕووس، کوردستان بەشی هەرە زۆری، لە ژێر دەستەلاّتی تورکاندا بووە، لە کاتی جەنگەکەدا بەشێکی لە ڕووی ڕۆژهەلاّتەوە کەوتە ژێر دەستەلاّتی ڕووسەکان، دواتر لە کاتی پاشەکشەیاندا لە ساڵی ١٩١٧ ، لە هەندێك شوێندا عوسمانیەکان چوونە شوێنی ڕووسەکان .

**سیسل جۆن ئیدمۆندس:** (جێی سەر سوڕمان نەبوو کە ئەگەر سلێمانی لەو سەردەمەدا، دیمەن و ڕواڵەتێکی توکلێکراوی ئازاردیوی هەبوو، لە دوا ساڵی شەڕدا هەموو کارەکانی ئەم شارە بە تەواوی ڕاوەستا بوون، وەرزێرەکان زەویەکانیان بە جێ هێشتبوون).

**پەیسەر پرێس:** (ستاندنی باجی زۆر لەلایەن عوسمانیەکانەوە لە خەڵکی کوردستان، بووە هۆی ئەوەی کەرتی کشتوکاڵ هەرەس بهێنێت و دواجار ببێتە هۆی کەمبوونەوە و بگرە نەمانی دانەوێڵەو بەو هۆیەشەوە برسیەتی هەموو ماڵەکان بگرێتەوە. وێڕای بوونی بارودۆخی خراپی ئابوری و سیاسی، لە هەمان کاتیشدا هەرچی ناوچەی کشتوکاڵی و دانەوێڵە هەبوو هەمووی سوتێنراوە، ئەوەش بووەتە هۆی دروستبوونی گرانی گەورە لە ناوچەکەدا).

**رفیق حلمی:** (لەم دەورەدا لە ڕووی خراپەو زوڵم و کردەوەی ناڕەوای کاربەدەستەکانی حکومەتی عوسمانی، ناڕاستی و ناپاکی بەشی زۆری مەئموورەکانی عەسکەری و مەدەنییەوە خەڵك بەجاری ڕوویان لە حکومەت

وەرگێڕابوو، جگە لەمەش بەناوی ئیعاشەی لەشکرەوە، هەرچی خواردەمەنی و ئازوقەی هەژار و فەقیر هەبوو، بەتایبەتی هی دێهاتی و لادێییە بەسەزمانەکان، بەبێ دوایی هاتن هەر ڕۆژە بەناوێکەوە، واتا جارێك بەناوی (موبایەعە) و گاهێك بەناوی (ایعانە) وە زەوت و تالآن ئەکرا، بەشی زۆری ئەوانە ئەدزراو لەناوکاربەدەست و گەورە بێ مروەت و ناپاکەکاندا بەش ئەکراو بەشێکی زۆر کەمی ئەگەیشتە عەمارەکانی میری، کە ئەدرا بە عەسکەرەکانی لەشکر، یا بە ژن و ماڵ و منالی مەئموورەکان و ئەو زابتانە، کە خۆیان لە سنوورەکاندا سنگیان ئەنا بە گوللەوە).

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** (دوای دەستپێکی جەنگ، هێزەکانی تورك، بە سەرباز و عەشایری کوردەوە، لەژێر سەرکردایەتی هەندێك لە ئەفسەران و ئەندام و پەرلەمان و کەسانی تردا بوون. هێزی سەفەریەی یەکەم و دووەم لە هەورامانەوە تا تەوریز، هەردوولای سنور، بەتایبەتی ولاّتی موکریان تالآن و وێران کردو زۆر کەسیان کوشت... دوو هێزی سەفەریەی تریش، لەنێوان خانەقین و کرند نارچەی لاهیجانیان دووچاری زەرەر و زیانێکی زۆر کرد. ئەگەرچی سوپای توورك لە سەر ئەستۆی کورد دەژیا، وەك لە یەکێك لەو ڕاپۆرتانەی کە بۆ شالیارگەی ناوەخۆی ئێران بەرزکراوەتەوە، هاتووە: لە شارێکی وەکو(خوی)، بەزۆری خۆراکیان لە دانیشتوان دەستاند. لە کاتێکدا ئەوان لە توانایاندا نەبوو، بەرگەی باری سەختی ژیانی خۆیان بگرن. کۆکس هەوڵدەدا ئەو بارە پەشۆکاوە لە چەند خاڵێکدا ڕوونبکاتەوە، لە خاڵی دووەمدا دەڵێ: ئەم شارۆچکەیە لە مەڕ و مالآت خاڵی

کراوه. هەموو کێڵگەکانی دەوروبەری خانەقین یا تێکدران، یا بێ بارتەقا بران، هەرچەندە خەڵك ناشێ خۆراك بۆ خۆیان دابین بکەن، ڕووسەکان بەردەوام داوای خواردن دەکەن. ئەفسەرەکان ماڵ بە ماڵ بەدوای خۆراکدا دەگەڕێن و خەڵك ناچار دەکەن میوانداریان بکات، تەنانەت بێوەژن و دایکی هەتیوانیش لەمە ڕزگاریان نەبووە. سوپای تورك بە کۆمەڵ ئاژەڵ و موڵك و ماڵیان برد و دەستیان بە سەردا گرت. لە ڕاستیدا سوپای تورك پێویستی بە هەموو شتێك هەبوو، بێبەش بوو لە هەموو ئەو شتانەی کە سوپا پێویستی پێ بوو. هۆکاری گواستنەوەیان نەبوو، ئازوقەو خۆراکیان نەبوو) .

لێرەدا وادەردەکەوێت، نە دەوڵەتی ڕووس نە دەوڵەتی عوسمانی، بەری لێپێچینەوەی سەربازەکانیان نەبووبێت، یان بەدەر لە یاسا و ڕێنماییەکانی جەنگ، خۆیان ڕێیان پێداون .

**تاهیر احمد حەوێزی**، لەباسی شاری کۆیەدا: (مەئمورەکانی حکومەت بەناوی مبایعە و یارمەتی عەسکەری، زادو زەخیرەیەکی زۆریان لە میللەت ستاند. زەخیرەی عالەمەکەیان دەبرد، دەیانگوت: (بابە ئێمە لە برسان دەمرین)، دەیانگوت: (دەوڵەت سەلامەت بێ ئێوە بامرن، قەیدی ناکا)!، بە هەر فێڵێك با، هەبوو هەندێك زەخیرەی دەشاردەوە، هەر دەیاندیتەوە و عارد و دیواریان دەکۆڵی، کە زەخیرەکەیان دەبرد، بە پاڕانەوە و دەست ماچ کردن ماڵەکەی خۆیان بە پارە پێ دەفرۆشتنەوە، ئەو جارەی تاقمێکی تر دەهاتن زەخیرەکەیان دەبردن. وە بە برسیەتیان دەهێشتنەوە! زەخیرەی نێو شارەکەیان لە (ادارە ـ ڕێژی) عەنبار دەکرد،

مەئمورەکان لەگەڵ هەندێ خەڵکی شارەکە ڕێککەوتبوون، ئارد و گەنم و ڕۆنیان پێ دەفرۆشتنەوە و ئەوانیش بە دزی دەیانفرۆشتەوە، بەڵام بە زۆر گران. وە گەنم و جۆی لادێییەکانش، بەشێکیان دەنارده تەق تەق، هەندێکیشیان دەبردە دوکان، لەوێ خۆڵیان لەگەڵ تێکەڵ دەکرد و بۆ عەسکەریان بە کەڵەکی ڕوانەی بەغدا دەکرد. مەلا احمدی ڕەش کۆیی، لە ترسی عەسکەری بە ماڵەوە چووبووە دەشتێ، لادێییەکان هەندێ زەخیرۆکەیان لە پریسکان ـ وەك تێچێنان، دەیانکردە بالیفۆکە، دەیانهێنا ماڵی مەلای، مامۆستا سیپارەی بۆ منداڵەکانی نوسیبۆوە، کە جندرمەکان دەهاتن، خێرا خێرا سیپارەکانیان بە دەنگ دەخوێندەوە، جندرمەکان دەیانگوت: (ئەوە مەلایەو دەرسی دەخونن، وا وەرن... وازیان لێ دەینان).

مەبەست لە کەڵەك، لێرەدا بەلەمە، چەند دارێکیان لە سەر چەند مەشکەیەکی پڕ لە هەوا توند کردون و دانەوێڵەیان لێ بارکردووە و بە هێزی بازوو بە هۆی سەوڵ بە ڕووباری زێی بچوکدا گەیشتووەتە ڕووباری دیجلە و لەوێشەوە بەرەو بەغداد، ئەو کات بەغداد هێشتا لە ژێر دەستەلاتی عوسمانیەکاندا بووە.

**جەمال بابان:** (لەبەر ئەوە کشتوکاڵ دواکەوت،یاخۆ هەرنەما باری ئابووری بەلای وێرانی و برسیەتیدا وەرگەڕا) .

**تارق جامباز:** (ئەو جەیشەی ڕووس بە یەك فەوج هات، هەر جێگایەکی گرتبا، تەواوی هەمووی دەسوتاند و تالانی دەکرد و خەڵکەکەشی دەکوشت و ڕەحمیان بە کەس نەدەکرد و دەستیان دەکرد بە تالان و هەرچی شتی خەڵکیان بکەوتبایە

بەر دەست یان خراپیان دەکرد یان دەیانبرد. گەلێك جار تورکەکان هەموو شتی ئەو خەڵکەیان دەرشت تێکەڵی یەکتریان دەکرد. یان شتیان لێ دەستاندن) .

جەنگ وێرانکاری بەدوای خۆیدا دەهێنێت، زوربەی شارستانیەکان بەهۆی جەنگەوە لەناوچوون...

**ڕۆستەم ڕەسوڵ تانگۆزی:** (جندرمەکانی تورك زۆربەی هەرە زۆری دانەوێڵەکانی خەڵکی گوندی تانگۆزی خۆشناوەتیان بە تالاّن بردبوو ئەوەی پێیان نەچووبوو، چەند جۆرێکیان تێکەڵی یەکتری کردبوون، بە شێوەیەك کە خەڵکەکە نەیان توانیوە، لە یەکتریان جیابکەنەوە و سودی لێ ببینن).

**زوبێر رەسوول چۆمانی:** (کاتێك ڕوسەکان گەیشتونەتە گوندەکانی باڵەکایەتی گەنم و دانەوێڵەکانیان یان سوتاندووە یان دەڕوباریان کردووە، تورکەکانیش هەر شوێنێك پێی گەیشتوون و زانیویانە خەڵکەکەی شەڕی نەکردووە خەلەو خەرمانیان سوتاندون، واتا لە هەردوو باردا کورد بەشی ماڵ وێرانی بووە).

**حەسەن ڕەسوڵ زێوەی:** (سەرەڕای کەمی باران و وشکە ساڵی، چەند چەکدارێکی کوردی (شکاك) هەڵیان کوتاوەتە سەر گوندی زێوەی خۆشناوەتی و تالاّنیان کردووە) .

شکاك هۆزێکی گەورەی کوردە، شوێنی نیشتەجێبوونیان دەکەوێتە باکوری خۆرهەلاّتی کوردستان، دەکرێ ئەو چەکدارانەی لێرەدا باسیان کراوە، چەکداری عوسمانیەکان بووبن.

**شادمان مەلا حەسەن:** (سوپای ڕووس لە چەندین قۆڵەوە هاتبووە ناو کوردستان، کردەوەی وەحشیگەرانەیان ئەنجامدا، لە سوپای تورك خراپتر. تورك سوپایەکی گەورەی بە سەر خەڵکی کوردستان جێهێشتبوو، خواردن و هێزی مرۆیی لەسەر کورد بوو، ئەو ناوچانەی شەڕی ڕوس و تورکی گەیشتبۆیێ، یان عوسمانی بێ بە زەبیانە هەرچی دانەوێڵەو ولاّغ و سەرمایەیان هەبوو، تالاّنیان کردبوو... دوای ئەوەی سوپای ڕووس، لە زۆر شوێنەوە گەیشتە قولاّیی کوردستان، کارەسات و مەرگەساتی گەورەی لەگەڵ خۆی هێنا، بەهاری ساڵی (١٩١٧) گەیشتە ناوچەی خانەقین، لە هەمان ساڵدا شۆڕشی ئۆکتۆبەر ڕوویدا، بۆیە سوپای ڕوسیا ناچار بە پاشەکشە بوو، لە گەڵ دەستی خۆیان هەرچی مەڕومالاّت و دانەوێڵەی ناوچەی خانەقین و شارەکانی تری ڕۆژهەلاّتی کوردستان هەبوو، لەگەڵ خۆیان بردیان و تالاّنیان کرد).

گەلی کورد زووربەی کاتەکان دوچاری تالاّنی و دەربەدەری بووەتەوە، هەر بۆیەش هەژاری بەرۆکی بەرنەداوە.

**مەحمود ئیسماعیل شێەیی و تۆفیق ئیسماعیل شێەیی:** (جندرمەکانی تورك هاتبوونە گوندی شێەی خۆشناوەتی و بە زۆرەملێ مریشك و دەغڵ و دان و چەك و تەقەمەنیان لە خەڵکەکە ستاندبوو) .

سەبارەت بە لێستاندنی چەك و تەقەمەنی، بێجگە لەوەی دەسکەوتێك بووە بۆ خۆیان، دەکرێ مەبەستی تریشیان هەبووبێ، وەکو ئەوەی خەڵکەکە نەتوانن ڕوو بە ڕوویان ببنەوە .

**خالید حوسێن:** (هەرچی ئازوقە و خۆراکی عەمبارکراویشە، بەتالآن برداوە) .

**تەیمور هەزیز**، لە کۆمێنتێکدا بۆی نوسیوە: (هەموو جارێك باوکم ئەیگێڕایەوە: سوپای عوسمانی لە پێش شەڕی جیهانی یەکەم، دایان بە سەر گوندەکەمان، ماڵ بە ماڵ دەگەڕان، هەرچی گەنم و ساوار و قەرەخەرمان و ئاردی مالآن هەبوو بردیان، خەڵکی لەو ساڵەدا توشی قات و قڕی و برسیەتی بوونەتەوە، وە گوندەکە دەکەوێتە ناوچەی (دوز خورما تو) .

**میر ئەحمەد میرە قەلآسەیدی:** (لەوکاتەدا قات و قڕیەکی زۆر دژوار لە ناوچەی بیتوێن و دەوروبەری ڕووی داوە،لە هیچ ولآتێك خواردەمەنی بۆ ئەو ناوچەیە نەهاتووە،ئەوەی هەشبووە لەلایەن جندرمە و سەربازەکانی تورکەوە دەستی بە سەردا گیراوە) .

**لازاریفەن:** (زەرەرو زیانێکی زۆر کەوتبوو لە مەڕو مالآت، کە سەرچاوەی سەرەکیی بژێوی و کاری کوردەکان بوو،چونکە دانیشتوانە کوردەکانی ناوخۆ توانای کشتوکاڵکردنیان نەبوو،بە هۆی ئەو ئۆپراسیۆنە سەربازیەی کە بەردەوام لە زەوی و زارەکانی ڕۆژهەلآتی تورکیاو هەروەها لە باکووری عێراقیش) .

**جەرجیس فەتحولآ:** (دەزگا سەربازییەکان ناچاردەبوون، بۆ تێرکردنی زگە برسیەکانیان، کە زۆر لە خەڵکی بکەن، ئازوقەو شتی دیکەیان پێ بە هەرزان بفرۆشن و بەو نرخەی کە خۆشیان دیارییان دەکرد، هەروەها زۆر پارەی کاغەزیان دەدانێ کە چارەکی نرخە ڕاستەقینەکەی خۆی نەدەکرد. زۆر جار ڕێو شوێنی سوپا داگیرکەرە کۆنەکانیان پەیڕەو دەکرد بەوەی پێویستیان بە هەرچییەك بوایە

دەیانبرد و پارەشیان نەدەدا. جوتیارەکان زەویەکانی خۆیان بە جێ هێشت و قبوڵیان نەکرد کشتوکاڵی تیادا بکەن، بۆیە نەخۆشی و برسیەتی لە شارەکاندا بلاّو بووەوە، بەڕادەیەك کە خەڵکی لە جادەکاندا دەکەوتن و دەمردن).

لە باشوری کوردستاندا زۆرن ئەو کاولەڕەزانەی کە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا ڕەزی بەردار بوون، بە هۆی زۆری باج و بلاّوبوونەوەی برسییەتی و قات و قڕی، خاوەنەکانیان وازیان لێ هێناون و بوونەتە کاولەڕەز..

**ئیحسان رەشاد موفتی:** (جوتیار ئەو گەنمەی کە بۆ چاندن هەڵیگرتبوو، یان سوپای عوسمانی کە باج لە سەر مەڕوماڵاّت چەند جار زیادیان کردبوو، هەرچی بهاتبایە ژێر دەستیان دەیانبرد)، لە سەر زاری ژنێك بەناوی (حاجی زولەیخا)، لە باسی گوندی قۆریتانی باشوری هەولێر نوسیویەتی: (جندرمەی تورکەکان دەهاتن، ئازوقەو مەڕوماڵاّتیشیان دەبرد).

هەتاکو ئێستاکەش، بەشێکی زۆری گەلی کورد، لە ژێر باری هەژاریدا دەناڵێنێت، یەکێك لە هۆکارەکان، ئەو هەموو کارەساتانەن کە لەلایەن داگیرکارانەوە بەسەری هاتوون، بەتایبەتی تالاّنی و سوتاندن، خێزانەکان هەر فریای ئەوە کەوتوون، خانویەك بۆ خۆیان دروست بکەن و ماڵێکی سادەو ساکار بنیادبنێن، دوای ماوەیەکی کەم کارەساتێکی تریان بەسەرهاتووەتەوەو گەڕاونەتەوە خاڵی سەرەتا لە دروستکردنەوەی خانوو و بنیادنانەوەی ماڵ.

## پەراوێز:

ئی.جەی.ئار، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، لاپەڕەکانی (١٢ و ٤٩و١٦و١٧و١٨و٢٠و٢٧).

ئیحسان ڕەشاد موفتی، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر - مێژووی کۆن، مێژووی ئیسلام، مێژووی نوێ)،لاپەڕەکانی (١٣٢٩) و (١٣٣٢).

بەختیار محەمەدئەمین ـ نوسەر، (جولەکەکانی کوردستان)، لاپەڕە (١٣٣).

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان ....) ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١ ، لێرەدا کورتەیەکمان لێ وەرگرتووە.

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم،لاپەڕە(١٣١ و ١٣٢).

تارق جامباز، (ناودارانی دەفەری سۆران...)، لاپەڕە (١٦).

تۆفیق ئیسماعیل مەحمود ، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/٩/٢ لە کۆمەڵگای شکارتە.

جەرجیس فەتحولا، (ووریابوونەوەی کورد .....)، لاپەڕە (٩٧).

جەلیلی جەلیل، م.س.لازاریف ، م.ا.حەسرەتیان، شاکرۆ محۆیان، ئۆلگا جیگالینا، (شۆڕشەکانی کورد لە سەردەمی نوێدا) لاپەڕەکانی (١٣٩ و ١٤٣).

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەم)،لاپەڕە(٥٢).

حەسەن ڕەسوڵ ئەحمەد، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٧/٢٠ لە گوندی زێوە.

ڕەسوڵ حەسەن ڕەسوڵ، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/١٥ لە بالیسان.

رفیق حلمی، (یاداشت)، لەلاپەڕە (٢٩).

ڕۆستەم ڕەسوڵ ئەحمەد ، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٧/٨/٦ گوندی ئانگۆز.

زوبێر ڕەسول چۆمانی، (گرانی بچوك و گرانی گەورە)، (فەیسبوك)،لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

سیسل جۆن ئیدمۆندس، (کورد تورك عەرەب) ، لە لاپەڕە (١١٥).

سەردار عەبدولرحمان حەسەن ، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/٢٨ لە شارۆچکەی سەروچاوەیە.

سەعید عەبدولاّ حەمە، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ۲۰۱۷/۹/۱۲ لە کۆمەڵگای شکارتە.

شادمان مەلا حەسەن، (کورد سوتەمەنیەکی هەرزانی جەنگ + کورد لە نێوان دوو بەرداشی سوتێنەردا) لە فەیسبوک لە لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

عەنبەر حەمەد ئەحمەد، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ۲۰۱۸/۱/۲۷ لە شاری هەولێر.

عەبدولاّ عەزیز عەبدولاّ، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ۲۰۱۷/۱۱/۱٦ لە گوندی دواوێ.

عەبدولاّ حەمەدەمین سلێمان، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ۲۰۱۸/۱/٦ لە گوندی سەرەشکەوتان.

فازڵ هاودیانی، (هاودیان)، لاپەڕەکانی (۲۹ ـ ۳۰).

قادر ئەحمەد فەرەج، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ۲۰۱۲/٥/۲٤ لە هۆبەی کشتوکاڵی سەروچاوە.

**کامەران ئەحمەد محمەدئەمین**، (کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا)،لاپەڕەکانی(۹٦ و ۹۸ و ۱۰۷ و ۱۱۱).

لازاریف.ن، (مێژووی کوردستان) لاپەڕە(۳۰۰).

مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی، (ڕواندز بباڵەك برادۆست) ٬لاپەڕە(۲٦).

محمد رسول هاوار، (کورد و باکوری کوردستان) لاپەڕەکانی (٥٤٤ و ۳۷۱ و ۳۷۲).

مدوح مزوری، (مێژووی ڕواندز)، لاپەڕە (۲۸۹).

مەحمود ئیسماعیل مەحمود، چاوپێکەوتن لە شەوی ۲۰۱۲/۹/۲ لە کۆمەڵگای شکارتە.

میر ئەحمەد میرە، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ۲۰۱۲/۱/٦، گوندی قەلاّ سەید.

نازەنین محمد وهبی، عەتا عەبدوللا معروف، دارا محمد عبدولاّ، (مێژووی نوێ و هاوچەرخ)، لاپەڕەکانی (۱۱٤ ـ ۱۱٥).

نەجمەدین شێخ کەریم، (شەڕی جیهانی یەکەم ۱۹۱٤ ـ ۱۹۱۸ ز)، گۆڤاری (k۲۱) لاپەڕە (٦۷)، فەیسبوک.

خالید حوسێن، (سەفەربەلك یان سەفەر بەرلك)، فەیس بوك، لە (٤) ی سێپتەمبری (۲۰۱۸).

## چوارەم: سەفەربەلك، ڕشبگیری، پەلکێشکردن بەرەو جەنگ

گەلی کورد یەکێك بووە لەو گەلانەی، زوربەی کات کورپیاوە گەنجەکانی، لەلایەن ولاتانی داگیرکاری کوردستانەوە، بە زۆر چەکدار کراون و بردراونەتە بەرەکانی جەنگ و قوربانی زۆریان بە خوێن و بە گیان داوە .

**خالید حوسێن:** (لە سالی (١٨٥٠)، سولتان (عبدالمجیدی یەکەم) بڕیارێکی دەرکرد بەناوی (سەفەربەلك)، واتا (نفیر عام یان شێوەیەك لە ڕەش بگیر)، کە لە هەر خێزانێك بە زۆر کوڕێکی تازە پێگەیشتوویان دەبرد بۆ سەربازی و لە دژی دەولەتی سەفەوی و دامرکاندنەوەی جەنگی ناوخۆ بەکاریان دەهێنان. لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەم، لەسالی (١٩١٤) سەفەربەلك لە تەواوی دەولەتی عوسمانی ڕاگەیەنرا، لە کوردستانی خۆشمان هەر مالە و مێرد منداڵێکیان لێ بردوون.پاش ئەوەی لەشکری عوسمانی داویەتی بە سەر گوندەکاندا و ئەوەی دەستی چەکی گرتووە، ڕاپێچی سەربازییان کردووە. ئەو کوردانەی لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی، بەبڕیاری سەفەربەلك براون بۆ شەڕی بەلقان و سربیا و تا کرواتیا و یوغسلافیای جاران، دوای تەواو بوونی جەنگ، ئەوانەی نەکوژراون زۆریان نەگەڕاونەتەوە و هەر لەو ولاتانە هاوسەرگیرییان کردووە و ماونەتەوە، بۆیە ئێستاش زۆرجار لێرەو لەوێ، دەبیسترێت کە فلان کەس باپیرەی کوردە و خەلکی یەکێك لەو ولاتانەیە،یان نازناوی (زۆراب، ڕۆستەم،...هتد)، بەنازناوی زۆرێك لەو کەسایەتیانەوە ماوە.خالێکی باوکم لە تەمەنی (١٧) سالی بەر ئەو

شالأوەی سەفەربەلك کەوتووە،کە خەڵکی گوندی (نارنجەڵە)ی هەورامان بوو، دوای کۆتایی جەنگ زۆر هەوڵ دراوە سۆراخی دەست بکەوێت، بەڵام هیچ سەرەداوێك تاکو ئێستا ڕوون نەبووەتەوە لە گەڕانەوەی یان مانەوەی لەو وڵاتانە، یان کوژرانی لە شەڕەکاندا).

**عەلی کەندی:** (شایانی باسە سەفەربەلك مانای ئەوەیە، کە دەستەڵاتی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی، لەسەرەتای هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان، داوای لە هەموو گەلانی توانادارى چەك هەڵگرتنی هەبوو، بچنە ڕیزی هێزەکانی سوپای عوسمانی، ئەویش بۆ شەڕکردن دژی ڕوسیاو وڵاتانی تەوەری شەڕکەر، واتا (نەفیر عام)، کە گەلی کوردستانیش یەکێك بوو، لەو گەلانەی ژێر داواکاریەکانیان، لە هەرێمەکان و بەتایبەتی لە باکوور و باشوری کوردستاندا).

لە چەند دەڤەرێکی کوردستاندا، کاتێ عوسمانیەکان ویستوویانە ڕەشبگیری بکەن، خەڵکەکە ڕووبەڕوویان بوونەتەوە و بەو زوڵمە ڕازی نەبوون.

**جەمال بابان:** (شەڕی گەورەی یەکەم دەستی پێ کرد و دەوڵەتی عوسمانی تێوەگلا،جاڕی نەفیری گشتیداو هەرچی گەنج یان پیاوێك کە دەستی تفەنگ بگرێ،خرانە ژێر باری چەك و سەربازییەوە،تەنها منداڵ و پیر و سەقەتەکان مانەوە) .

**سەید مەولود بێخاڵی:** (بۆ ڕاپێچکردنی ئەو نێرینانەی توانادارى چەك هەڵگرتنیان هەبوو، بۆ بەهێزکردنی ڕیزەکانی سوپای عوسمانی. بۆ شەڕکردن دژ بە ڕوسیاو وڵاتانی هاوپەیمانی جەمسەری شەڕ، لە ٢٢ـ١١ـ١٩١٤، ڕژێمی

عوسمانی بانگەوازێکی ئایینی دژ بە هاوپەیمانانی شەڕ ڕاگەیاند، هەولێر شڵەژاو سستی ئابووری بێ کاری ڕۆژانەی تێکەوت، چونکە بەناوی سەفەربەگ ژمارە نێرینەکانی زۆریان لە گەنج و بەتەمەنداچووەکانی بەرەو شەڕ نێردران) .

دانیشتوانی هەولێر و گوندەکانی دەوروبەری، بە ئاین موسڵمان بوون، تەها گوندی عەنکاوە نەبێت کە دەکەوتە باکوری هەولێر، ئەوان بە ئاین مەسیحی بوون، ئەو کات سەر قەڵای هەولێر ئاوادانیەکی گەورە بووە، کوردە موسڵمانەکانی تیادا ژیاون .

**قادر ئەحمەد فەرەج مەرگەیی:** (پیاوێکی گوندی (بنگرد) ی بەری مەرگە، ناوی (حەسەن عەزیز) بوو، دەیگوت: جندرمەکانی تورك کردمیانە سەرباز و بۆ بەرەکانی شەڕیان بردمە تورکیا ماوەی دوازدە ساڵان لەوێ دوور لە کەسوکارەکانم مامەوە، دواتر گەڕامەوە ناوچەکەم) .

**عەلی حەسەن شێخەیی:** داپیرم ناوی (ئایشە) بوو دەیگێڕایەوە: (ڕۆژێك ژمارەیەکی زۆر جندرمەی تورك بەرپرسێکیان لەگەڵدا بوو هاتنە گوندی شێخەی سەرووی خۆشناوەتی جندرمەکان کوڕ و پیاوە گەنجەکانی گوندەکەیان لە (باسکی جۆخینێ)، کۆکردنەوە، بەو مەبەستەی دەستگیریان بکەن و بۆ سەربازی و بەرەکانی جەنگ بیانبەن، یەکێك لە پیاوە گەنجەکانی گوند، ناوی (عەولا چاوشین) بوو، ئەو دوو ژنی هەبوو، لە هەر ژنێك چەند منداڵێکی هەبوو، منداڵەکان هەندێکیان برازای خۆی بوون، کاتێ براکەی مردبوو ژنەکەی مارە کردبووەوە ، بە خێوکردنی منداڵەکانیشی گرتبوە ئەستۆی خۆی ، خانەوادەکەی

(عەولاّ چاوشین) ژنێکی بەتەمەنیان هەبوو، هەموو منداڵەکان و هەردوو ژنی (عەوڵلاّ چاوشین)ی بەدوای خۆیدا و بردنیە ئەو شوێنەی کە گەنجانی گوندەکەیان لێ کۆکردبوونەوە ، (قوماندارى تورکان) کە بەرپرسی جەندرمەکان بوو ، وەرگێڕێکی زمانی لەگەڵدا بوو ، ئەو کورد بوو ، قوماندارەکە ڕووی لە پیرەژنەکە کرد و بە زمانی تورکی چەند قسەیەکی کرد ، وەرگێڕەکە بەو شێوەیە قسەکانی بۆ پیرەژنەکە کردنەوە کوردی (ئێوە بۆچی هاتوونەتە ئێرە) ؟ ئەویش باسی هۆکاری هاتنی کرد، وەرگێڕەکە قسەکانی هەردووکیانی وەرئەگێڕا، لە کوردی بۆ تورکی ، لە تورکی بۆ کوردی، پیرەژنەکە داوای ئازاد کردنی (عەولاّ) ی دەکرد، بە بیانوی ئەوەی ژن و منداڵی زۆری هەیە و کەسێکی تر نییە بژێوی ژیانیان دابین بکات، قوماندار کە بەوشێوەیەی بینین ، بەزەیی پێداهاتنەوە و عەبدولاّی ئازاد کردا بەلاّم گەنجەکانی تریان بردن، بۆ نمونە: (عەزیز حاجی مەولود و داودی هەمینە گەورێ و خارە حەم و مامەحمەر و حاجی مەولود) .

باسکی جۆخینێ دەکەوێتە ڕۆژئاوای گوندەکە. سەبارەت بە ئازادکردنی ئەو پیاوە، دەکرێت قوماندارەکە پیاوێکی بە ویژدان بووبێت و ڕەچاوی بارودۆخی خێزانەکەی کردبێت، یان ئەگەر بە پێی یاسای سەربازی خەڵکیان کردبێتە سەرباز دەکرێت لە یاساکەدا ئەو پیاوانەی کە دوو خێزانیان هەبووە، سەربازی نەیگرتبنەوە یان دەکرێت بە پارە خۆی کڕیبێتەوە و لێرەدا باس نەکرابێت. سێ گەنجی تری گوندی (شیەی سەروو) کە تورکەکان بە زۆر بردونیاننەتە بەرەکانی جەنگ وەکو: (مستەفا حاجی مەولود و وەیس حاجی مەولود و حەمەدی هەمینە گەورێ)،

لەوانە (مستەفا و وەیس) ئێستاش لەگەڵدابێت نەگەڕاونەتەوە و کەس نازانێ چیان بەسەر هاتووە .

**شادمان مەلا حەسەن:** (ئەو کات سوپای عوسمانی کە ناسراو بوو بە(ئوردوی هومایۆن)، لە چواردە سوپا یاخود فەیلەق ڕێکخرابوو، هەر فەیلەقێك چەند تیپێك بوو، هەر فەیلەقێك یان سوپایەك زیاتر لە چلویەك هەزار سەربازی هەبوو، کورد ژمارەیەکی زۆری سەرباز بوو، نموونە هەردوو سوپای نۆ و دە، بە تەواوی کورد بوون، بە فەرماندە و ئەفسەر و سەربازەوە، هەروەها سەد و سی و حەوت یەکەی سوارە (وحدە خیالە) کورد بوون، جگە لەو سوپا پاشکۆیانەی کە لە عەشیەت و خۆبەخشە ئیماندارەکان ڕێکخرابوون. (ئەمین زەکی بەگ) کە فەرماندەیەکی بالاّی سوپای عوسمانی بووە، دەڵێ: لەم جەنگە زیاتر لە سێ سەد هەزار جەنگاوەری کورد لەناوچوون، تاکو جەنگ تەواو بوو، بەبێ ئەوەی یەك سودی بۆ کورد هەبووبێ، ئەوێ ڕۆژێ ئەگەر ئەو ئەفسەرو سەربازانەی کورد، هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی خۆیان، لە سەروی هەستی ئاینداری و وابەستە بە عوسمانی هەبوایە، دەیانتوانی کوردستان بکەنە ولاّتێك، کوردیش لە زۆر مەینەت ڕزگار بکەن).

**محمد ئەمین زەکی:** (کورد وەکو قەومەکانی تری عوسمانی، بەڵکوو زیاتر لەوان لە دەوری سەفەربەریدا، توشی زەرەر بوو. ئەوەڵەن هەرچی ئەولادی جاهیل و بەکاری هەبوو، بە زۆر هێنرایە ژێر سیلاحەوە و زۆر ماڵی واهەبوو کە بە غەیری ئافرەت و منداڵ و پیرەمێرد ، کەسی تیا نەمابوو، ئەوانەی کە تۆزێ حاڵ و وەقتیان

باش بوو، بەناوی (بەدلی نەقدی، تکالیفی حربیە، وسائیلی نقلیە، اعانە، برتیل...الخ) ەوە ڕوتکرانەوە، ئەو ئەولادانەی کە هێنرابوونە ژێر سیلاحەوە، زۆری بۆ جیهەی ئەرزرۆم و بەشێکیشی بۆ تەرەفی سوریاو بەسرا نێردرا، بەم تەرحە بەشێکی زۆری کاسبیکەری لە دەس چوو. کورد لەو ئەولادانەی کە ناردبوونی بۆ شەڕ، کەمی دەست کەوتەوە، بەشی زۆر زۆری لە شەڕدا، لەئەسارەتدا، لەبرسانا، لەسەرمانا، بە نەخۆشی لە دەست چوو. میقداری زایعاتەکەی کەس نایزانێ، بەلاّم ئەگەر بە تەخمین جائیزبێ، رەنگە میقداری ئەمانەلە (٣٠٠٠٠٠) زیاتر بێ) ! .

عوسمانیەکان لە سێ بەرەوە جەنگاون، لە بەرەی ئەرزەرۆم لە گەڵ ڕووسەکان، لەبەرەی بەسرا لەگەڵ ئینگلیزەکان، لە بەرەی سوریا لەگەڵ فەرەنسیەکان. بە پێی ئەو ئامارانەی سەرەوە، ئەو کات سوپای عوسمانی زیاتر لە (٥٧٤٠٠٠) سەرباز بووە، گەر وای دابنێین (٣٠٠٠٠٠) جەنگاوەری کورد لە ناو چووبن، کەواتە زیاتر لە نیوەی سوپای عوسمانی کورد بووە .

**حوسێن حەمید خەتی و نوری بەکر خەتی:** (تورکەکان چەند گەنجێکی گوندی خەتێی خۆشناوەتییان بە زۆر کردبوونە سەرباز و بۆ بەرەکانی جەنگیان بردبوون،تاکو ئێستاش هەندێکیان بێ سەرو شوێنن و نەگەڕاونەتەوە و هیچ دەنگوباسێکیان نییە) .

**نازەنین محمد وهبی و ئەوانی دیکە:** (سەرەتاکانی جەنگ عوسمانییەکان بەناوی (غەزا و جیهاد) توانییان بەشی زۆری کوردان ڕاکێشنە ناو جەنگ و ناوچەکانی

دەورو پشتی دەریاچەی ئورمییە (رەزائیە) داگیر بکەن و کاولکاری و تالآنی تیادا بنێننەوە) .

**ساڵح قەفتان:** (کوردەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا بەرەنگاری مەینەتی زۆر گەورە بوون، چونکە لە جەنگەکەدا زۆر لە لاوەکانیان کوژران) .

**کەریم شەریف ئانگۆزی:** (تورکەکان چەند گەنجێکی گوندی ئانگۆزی خۆشناوەتییان کردبوونە سەرباز، یەکێك لەوانە پیاوێك بوو بە ناوی(سلێمان) ،لە شەڕی تورك و ڕووس،لە وەرزی پایز لە شاخی هەندرێن شەهید بووە، تەرمەکەی لەوێ بەجێ مابوو، کە بەهار داهاتبوو،یەکێك لەوانەی لە گەڵیدابووە و چەند پیاوێکی تری گوندەکە چووبوون و تەرمەکەیان هێنابۆوە،لەو ماوە زۆرەدا لاشەکەی تێك نەچووبوو) ! .

**عبدالرحمان حاجی عبدالله ئانگۆزی**، کە دەکاتە نەوەی (سلێمان) دەڵێت: (لە کاتی شەڕی عوسمانی و ڕووس، چەند پیاوێکی چەکدار و عەشایری خۆشناوەتی کە لایەنگری تورکان بوون، شەڕیان لە دژی ڕووسان کردووە، (سلێمان)ی باپیرم لەو شەڕەدا لە (شاخە ڕووتە)ی دۆڵی خانەقا شەهید بووە).

لەو ڕووداوەدا باسی ساڵانی (١٩١٦ و ١٩١٧) دەکرێت، شاخی هەندرێن و شاخە ڕووتە، دەکەونە نزیك ڕواندوز و هەردووکیان لە یەکتریەوە نزیکن، ئەوێ ناوچەیەکی کوێستانییە و هەتاکو وەرزی هاوین بەفری لێ دەمێنێت، دەکرێت شەهیدەکە بەهۆی بەفر و سەرماوە لاشەکەی تێك نەچووبێت .

**تاهیر احمد حەویزی:** (هەرچی نێرینەی ئیشکەر هەبوو، ناردرانە عەسکەری، زۆریان لێ شەهید و برینداربوو. کەلە مێژووی بنەماڵەکانی شارەکە دەکۆڵمەوە، ماڵ نییە یەك دووەکی لە سەفەربەلکێ نەهاتبیتەوە، نزیکەی (۳) هەزار گەنج و پیاوی فەوتاو نەهاتۆتەوە).

لێرەدا مەبەستی نوسەر، بنەماڵەکانی شاری کۆیەیە.

**عەبدولاّ حەمەدەمین سەریکانی:** (لە سەردەمی گرانیەکەدا، تورك هاتبوونە گوندی سەریکانی خۆشناوەتی و (۸ ـ ۱۰) گەنجی گوندەکەیان بە زۆر بۆ سەربازی و بەرەکانی جەنگ بردبوون، ناوی دووانیان دەزانم، یەکێکیان باپیری من بووە بەناوی (سلێمان)، ئەوەی تر ناوی (قادر حەمەد) بووە، تاکو ئێستاش بێ سەر و شوێنن و هیچ هەواڵێکیان نی یە، دوای چەند ساڵێك، باوکی منیشیان بردبۆ بەرەکانی جەنگ بەرەو ئەرزەڕۆمێ، بەلاّم ئەو دوای پێنج ساڵ ڕایکردبوو گەڕابۆوە).

بە پێی چەند گێڕانەوەیەکی تر، لە پەڕتوکی (خۆشناوەتی لە سەدەی بیستەمدا ـ بەرگی یەکەم)، تورکەکان (۱۹) کەسی ئەو گوندەیان بردووە، دوای جەنگەکە چەند کەسێکیان کە لە ژیاندا مابوون، لە ڕۆژئاوای کوردستان گوندێکیان بەناوی (سەریکانی) بنیاد ناوە .

**فەقێ شێخ وەسانی:** (لە سەردەمی (سەفەر بە لك) هەزاران کەس لە کوردستان و خۆشناوەتی لەو سەفەرە بێ سەرو شوێن بوون و بە هەزاران بە دیلی کەوتنە دەست ڕوسەکان و کڕین و فرۆشتنیان پێ کراوە و کاری کشتوکاڵیان پێ دەکردن،

دەیان کردنە شوان و گاوان، زۆریان کوردستان و کەسوکاریان نەدیتنەوە، وە بەشێکیان دوای دە ساڵ هاتنەوە و نمونەی (مام وەیسەی شێخوەسانی) و زۆری تر، بە سەدان سەرباز و دیلەکان کڕین و فرۆشتنیان پێ کراوە و بەتایبەتی ڕوسەکان باب و باپیران پێیان دەگوتن (حورس) بەشێك لەو سەربازانە لەلایەن خەڵکی یەوە ئازاد دەکران و ژنیان هێناو دواتر مناڵەکانیان بە جێ هێشتن بە هۆی غوربەتی وڵات و کەس و کاریان) .

مام وەیسی شێخوەسانی لە ڕووسیا فێری هونەری خانو دروستکردن بووە، کە گەڕاوەتەوە کوردستان لە دەڤەری خۆشناوەتیدا دەستی بە دروستکردنی خانووی بەرد و خشت کردووە، بە شێوەیەکی ئەندازەیی دیوارەکانی داناون، چەندین خانووی دوونهۆم و سێ نهۆمی لە دۆڵی بالیسان دروستکردوون .

**محمدحسن سەرگەینێڵی:** (کاك ئاکۆی هەباساغا بۆی باسکردم، کە (مەمەند ئاغا) بەشداری شەڕی ڕوسی کردووە، تا ئەو ساڵانەی ڕابردووش، نیشانەی ئازایی کە تورك پێیاندابوو مابوو. هەروەها پیرانی مەمەندەمەرە باسیان کرد کە پشدەرە ڕەقەش، بەشداری شەڕی ڕوسیان کردووە، دیسان (ئەحمەدی حەسەنی قۆچاڵی سەرگەینێڵی) بۆی باسکردم: شارۆشیەکان لەوانە (خدر ئامان) بەشداری شەڕی کردووە، کە خانەدان بوون خاوەن ئاش بوون لە سوورەدێ، دەچن داوا لە (غەفورخان) دەکەن چەك بەوان بدات، تا ئەوانیش بەشداری لەو شەڕەدا بکەن، ئەویش چەکیان پێ دەدات و ژمارەیەکی زۆر سەرگەینێڵی، وەك (برایمی حسێنی) برای باپیرم، لەو شەڕەدا بەشداری دەکەن و یارمەتی لە غەفورخانی وەردەگرن،

لەو شەڕەداو دواجار سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست دێنن و زۆریان لێ دەکوژن و زۆر تفەنگ دەگرن و بەسەرکەوتویی دەگەڕێنەوە) .

مەمەنداغا کەسایەتیەکی دیاری کۆمەلاّیەتی هۆزی ئاکۆ بووە، هەروەها غەفورخانیش کەسایەتیەکی دیاری ناودەشت بووە لە دەڤەری پشدەر .

**محمد ڕەسوول هاوار:** (میللەتی کورد لە شەڕی جیهانی یەکەمدا، کە بە (سەفەربەر) ناسراو بووە لای کورد، ولاّتەکەی کرابوو بە کۆڕی شەڕی نێوان (تورك و ڕوس و ئینگلیز)، لەو شەڕەدا کورد زیانێکی زۆری ماڵی و گیانی لێ کەوت، ولاّتەکەی کاول کراو بە دەیان هەزاری لە کۆڕی شەڕەکانا کوژرا.لە نزیك (ریزا)، سەربازەکانی کورد لە هێزی حکوومەت جیا دەبوونەوە، دەچوونە پاڵ یاخی بووەکان، بۆ نمونە: پەیامنێری ڕۆژنامەی (ئورایزن) ی ئەرمەنی ژمارە (٦٦) ی ڕۆژی ٢٧/٣/١٩١٤ نوسیبوی: کوردە یاخی بووەکان دەڵێن: لەبەرچی کاربەدەستەکانی حکوومەت موچەی زۆر وەردەگرن و ژمارەی ئەو بەرتیل خۆرانەی تورك کە هەر خەریکی ڕاو ڕوتن ژمارەیان تا دێ زۆرتر دەبێ؟ ئەو کردەوەیە هەمووی بۆ ئەوەیە جوتیاران و دانیشتوانی شارەکانی کوردی پێ هەژار بکرێ.جەلیلی لە لاپەڕە (٢٠١) دا، ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (ئازتامارت) ی ژمارە (١٥٢٤) ی ٢٩/٣/ ١٩١٤ی ئەرمەنی کردووە، کە گرتنی سەرباز کارێکی وای کردبوو بوو بووە هۆی بلاّوبوونەوەی گرانی و برسیەتی. لەو شەڕەدا هەرچی لاوو گەنج هەبوو، مرۆڤی بەسالاّچووش لە سەربازیی و بێگاری عوسمانی ڕزگاری

نەبوو، هەموویان بە زۆرە ملێ گیران و کران بە سەرباز و چەك هەڵگر، ئەو کارە بوو بە هۆی ئەوەی بە هەزاران گەنج و لاو لە خێزانەکانیان دورخرانەوە) .

**پەیسەر پرێس:** (بە پێی وتەی شارەزایان،کوردەکان شەڕیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەکرد لە بەرەکانی جەنگ بەتایبەتیش لە بەرەی ڕۆژهەلاَت دژی سوپای ڕوسیا،کە دەیویست لە سنورەکانی(وان و ئەرزەڕۆم و سیواس) بێتە ناو خاکی تورکیا بۆ ئەو مەبەستەش دەوڵەتی عوسمانی هێزێکی زۆری کۆکردەوە لە کوردستان بەتایبەتیش سوپای(٩ و ١٠ )،لە ئەرزەڕۆم و سیواس کە زۆرینەیان لە کوردەکان پێك دەهاتن) .

**ئیحسان ڕەشاد موفتی**، لە سەر زاری ژنێکی گوندی قۆریتانی باشووری هەولێر بەناوی (حاجی زولەیخا) ، نوسیویەتی: (جندرمەی تورکەکان دەهاتن، پیاوو لاوی گوند ڕاپێچ بکەن بۆ ئاگری شەڕ، ئەوانیش خۆیان دوور دەخستەوە، نەوەك ڕاپێچ بکرێن بۆ شەڕی ئینگلیز.....) .

گەر بێت و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بۆ ئەو کەسانە بکەین، کە ڕووس و تورك ڕاپێچی بەرەکانی جەنگیان کردوونە و نەگەڕاونەتەوە و لە کاتی جەنگەکەدا نەکوژراون، ڕەنگە لە ڕووسیا و تورکیا و ....هیتر، منداڵ و نەوەکانیان بدۆزینەوە، ئەوەی لێرەدا باسمانکردووە، نمونەیەکی بچووکی بە زۆر کردنە سەرباز و بێ سەروشوێنی گەنجانی کوردە، هەر تەنها لە سەر ناوچەی خۆشناوەتی، دەتوانین بە سەدان نمونەی بەسەبازکردن و شەهید بوون و بێ سەروشوێن بوون بهێنینەوە، بەلاَم لێرەدا نامانەوێ نووسینەکە لەسەر ئەو ناوچەیە چڕبکەینەوە .

**فەقێ علی مدریس پێنتواتی:** داپیرم بە ناوی (ئاسیا خان)، کە بە بنەچە خەڵکی شارەدێی (تەلەعفەر) بوو، بەو شێوەیە دەیگێڕایەوە: (لە بیرم دێت خەڵکی هەولێر لە سەر داوای مەلایەکان لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی چوونە غەزا، بەرەو ڕواندز و دەوروبەری، لە دژی سوپای ڕووس، کە خەریك بوو بەرەو هەولێر پێشڕەوی بکەن، چەندین یەکەی سوپای ڕوس بە دیل گیران، یەکێك لەوانە کچێکی سەربازی ڕوس بوو، کە بە بریندارى دەستگیر کرابوو هێنابوویانە هەولێر ماڵی شێخی چۆلی دواتر لە بەر سەختی برینەکانی گیانی لە دەستدا) .

لێرەدا گومان لەوەدا نەما کە عوسمانیەکان، ژمارەیەکی زۆر لە کوڕ و پیاوی گەنج و بەتەمەنی کوردیان کردووەتە سەرباز و ڕەوانەی بەرەکانی جەنگیان کردون، بەو هۆیەوە دەستی کار لە کوردستاندا بەتایبەتی لە نێو کورددا کەم بووەتەوە، ئەوەش هۆکارێك بووە بۆ بڵاوبوونەوەی گرانیی و برسییەتی .

## پەراوێز:

ئیحسان رەشاد موفتی، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر ـ مێژووی کۆن، مێژووی ئیسلام، مێژووی نوێ)، لاپەڕە (١٣٣٢).

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان ـ چیرۆکە ناخ هەژێنەکانی سەردەمی گرانییە گەورەکەی کوردستان)، گۆگڵ، رۆژی ٣١/٧/٢٠١٩.

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم،لاپەڕە (١٣١)، و پەروێزی لاپەڕە (١٣٦).

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەم)، بەرگی یەکەم و دووەم، لاپەڕە (٥٢).

حوسێن حەمید خەتی، چاوپێکەوتن لە ٢٨/٩/٢٠١٢ گوندی خەتێ.

سالح قەفتان، (مێژووی گەلی کورد و نەتەوەی کورد تورکمان نییە)، لاپەڕە (٢٩٥).

سەید مەولود بێخالی، (هەولێرم وا دیوە....)،لاپەڕە(١٣٣).

شادمان مەلا حەسەن، (کورد لە جەنگی جیهانی یەکەم)، فەیسبوک لە لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

عبدالرحمان حاجی عبدولاّ ئانگۆزی، چاوپێکەوتن لە رۆژی ٢٢/٩/٢٠١٩، لە شارەوانی سەروچاوە.

عەبدولاّ حەمەدەمین سلێمان سەریکانی، چاوپێکەوتن لە رۆژی ٦/١/٢٠١٨ لە گوندی سەرەشکەوتان.

عەلی حەسەن عەبدولاّ شێخی، چاوپێکەوتن لە رۆژی ١/٩/٢٠١٢ لە گوندی خۆران

عەلی کەندی، (ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە)، بەرگی دووەم،لاپەڕە (٩٨).

فەقێ شێخوسانی، (خۆشناوو دۆ و دۆشاو)، لاپەڕە (٢٣).

فەتحی علی مدریس بێتواتی: لە رۆژی ٢٥/٤/٢٠٢٠، زانیاریەکانی لە رێی فایبەرەوە بە دەستنوس بۆ ناردم.

قادر ئەحمەد فەرەج مەرگەیی، چاوپێکەوتن لە رۆژی ٢٤/٥/٢٠١٢ لە هۆبەی کشتوکاڵی سەروچاوە.

کەریم شەریف عەبدولاّ ئانگۆزی، چاوپێکەوتن لە ١٨/٤/٢٠١٧ لە گوندی ئانگۆز.

محمد رسول هاوار، (کورد و باکوری کوردستان) لاپەڕەکانی (٣٧١ و ٥٤٦ و ٥٤٧).

محمد ئەمین زەکی، (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان) بەرگی یەکەم و دووەم،لاپەڕە (١٧٧).

م.محمدحسن سەرگەیینێلی، (هۆزی ئاکۆ لە نێوان مێژووی کۆن و نوێدا)، لاپەڕەکانی (٣٩٩ و ٤٠٠).

نوری بەکر عەبدولاّ خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٨/٩/٢٠١٢ لە گوندی خەتێ.

نازەنین محمد وهبی، عەتا عەبدوللا معروف، دارا محمد عبدولاّ، (مێژووی نوێ و هاوچەرخ - بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی) لاپەڕە (١١٤ - ١١٥).

خالید حوسێن، (سەفەربەلك یان سەفەر بەرلك)، لاپەڕەی تایبەتی خۆی لە فەیس بوك، لە (١٤) ی نوفمبری (٢٠١٨).

## پێنجەم: سووتاندن و وێرانکردنی خانوو و ماڵ و موڵك

هەر شوێنێك بکەوێتە بەر ڕق و کینەی شەڕ، خانوو ماڵ و شارستانیەت وێران دەبێت، کوردستان یەکێکە لەو وڵاتانەی زۆربەی کاتەکان مەیدانی زۆرانبازی پێکدادانی زلهێزەکان بووە .

**محمد ئەمین زەکی:** (زەرەری تەخریبان حەدو حیسابی وێرانی هەر خوا ئەیزانیّ، ئەم زەرەرە دوو نەوعە: یەکێکیان لە تەرەف دوژمنەوە کراوە و ئەمەش هەر شمولی بۆ ئەو وڵاتانە هەیە کە توشی ئیستیلابوون، وەکو وڵاتی (ئەرزەڕۆم، ئەرزنجان، وان، بەتلیس) ، بەشێکی وڵاتی موسڵ (ڕواندز) ، دوژمن لەو وڵاتانەدا بە تەبیعەت تەخریباتێکی زۆری کرد و باخسوس چەتەی ئەرمەن و غەیرە، گەلێ جێگایان بە فکری ئینتیقام وێرانکرد و سووتاندیان. دووەم نەوعی تەخریبات،لە تەرەف ئوردوی عوسمانییەوە کراوە، بەشێکی ئەمەش لە سەر زەروورەت و ئیحتیاج بوو، بەڵام بەشێکیشی کەیفی بوو. خولاسە ئەوانەی کە لە وەقتی حەربدا، وەیا لە دوایدا مەناتقی حەربیە گەڕابن، دەرەجەی ئەم تەخریباتە باشتر تەقدیر ئەکەن و لام وایە تا بیست ساڵی تریش ناچێتەوە دۆخی جارانی. خولاسە قەومی کورد لە شەڕی گەورەدا، توشی زەرەری ماڵ و ڕوحێکی بێ غایەت بوو) .

چەتەی ئەرمەن، لەو کاتدا ئەوان لایەنگر و چەکداری ڕووسان بوون .

**مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی:** (لەساڵی(١٩١٦)لەسەردەستی سەربازەکانی ڕوسیای تزاری، شاری ڕواندز بە جاریٚ وێران بوو، خەڵکەکەش دەربەدەرو ئاوارە بوون. هەر وەکو خوالێخۆش بوو (مستەفای حاجی ڕەزاق) لە یاداشتەکەیدا نووسیویەتی: لە ڕۆژی ١٥/٤/١٩١٦ دا عەسکەری ڕووس لە ژێر قیادەی قائد (جەنەرال چیور نوزوبۆف) لە ڕێگای (خانە، حاجی ئۆمەران، دەربەند)، داخلی شاری ڕواندز بوو، ماوەی زیاتر لە (٣) مانگ لەناو ڕواندز مایەوەو لەو ماوەیەدا هەموو خانوو مزگەوت و کەنیسەی سوتاندن و ڕوخاندن) .

**شادمان مەلا حەسەن:** (ئەو ناوچانەی شەڕی ڕووس و تورکی گەیشتبۆییٚ، زۆر شار و گوند بەتەواوی یان نیمچە تەواوی لە ناوچوون. ناوچەی باڵەکایەتی لە سەد گوند تەنها سیٚ گوند بە سەلامەتی مایەوە، شاری ڕواندز لە دوو هەزار خانوو تەنها شەست خانوو مایەوە) .

**ئی.جەی.ئار:** (ئەو وێرانکاریەی خانەقین کە لەلایەن ڕوسەکانەوە دەستی پێکرد، تورکەکان بە تەواو بوونیان گەیاند و ئەشکنجەدان توند و تیژتر بوو. دەرکەوت ناوچەکە لە ڕەواندوز، بە هۆی لێشاوی یەك لە دوای یەکی هاتنە پێشەوەی ڕوس و تورکەوە، کە ولاّتی کردبوو بە چۆڵەوانییەکی زۆر بەرچاو ناو شار لە کۆی (٢٠٠٠) خانویەك، تەنها (٦٠) خانوی بە پێوە مابوو).

**عەبدولڕحمان عەلی مەلەکی و ستار مەحمود مەلەکی:** (لە کاتی گرانیەکەدا سەبازەکانی ڕووس هاتبوونە گوندی مەلەکانی خۆشناوەتی و گوندەکەیان سوتاندبوو).

گوندی مەلەکان دەکەوێتە باشوری خۆرهەلآتی ڕواندوز، دەکرێ سوتاندنی گوندەکە لەلایەن ڕووسەکانەوە لە ساڵی (١٩١٦) بووبێت، لەکاتی سوتاندن و وێرانکردنی ڕواندوز .

**زوبێر ڕەسول چۆمانی:** (عوسمانییەکان کوردەکانیان واتێگەیاندووە کە شەڕکردن لە دژی ڕووس غەزایە، بۆیە سوپای ڕووس گەیشتووەتە هەر گوندێك، خەڵك بەو چەکە سادانەی هەیانبووە، شەڕیان کردووە و لە بەرامبەردا، ڕووسەکان کاتێك گەیشتوونەتە گوندەکە، سەرتاپایان خاپور کردووە) .

بەشێکی زۆری گەلی کورد، زۆر بە دڵسۆزانە کەوتووەتە ژێر کاریگەری بیروباوەڕی غەزاوە .

**فازڵ هاودیانی:** (دوای دوو ساڵ واتا (١٩١٦)، لە مانگی ئایار دەنگۆ بلآوبووەوە، ڕووس لە ئێرانێ دێت بۆ پەلاماردانی کوردستان، خەڵك ناوبانگی ڕووسی زانیبوو، زۆر ترسان کە زوڵمدارە، بۆ ماوەی چەند ڕۆژ شەڕکردن لە سەر سنوورەکان، گەیشتە دەشتە دیانێ، جا ئەوەی پێی کرا کردی، چ لە کوشتن و سوتاندن و .....هیتر، ماوەی زوڵمدارییان تەنها سێ مانگ بوو) .

**عەبدوڵا حەمەدەمین یاسین تۆتمەیی:** (کاتێ ڕووسەکان لە ڕواندز و باڵەکایەتی، بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان پاشەکشەیان کردبوو، هەموو ئەو گوندانەیان سوتاندبوون کە کەوتبوونە سەر ڕێگایان، بەتایبەتی گوندەکانی باڵەکایەتی، خەڵکی باڵەکایەتی لێیان هاتبوونە دەست و خەڵکێکی زۆری دەوروبەری باڵەکایەتی و خۆشناوەتیش هاوکاری خەڵکی باڵەکایەتیان کردبوو، لە ڕووسەکان و لە کوردەکانیش ژمارەیەکی زۆر کوژرابوون،پیاوێکی کورد لە باڵەکایەتی، بە دوای ڕووسەکان کەوتبوو و بانگی کردبوون: (بگەڕێنەوە کوڕە مەڕۆن، ئەوانە عەشایرن و سەربازی تورکان نین)، بەڵام ڕووسەکان گوێیان پێ نەدابوو، کاتێ گەیشتبوونە گوندەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، خەڵك و ئاغاکانی ئەوێ، لە ترسی ئەوەی نەوەك ناوچەکەی ئەوانیش، وەك و گوندەکانی باڵەکایەتی و ڕواندوز وێران بکەن، ژن و پیاو بە دارو بەرد و چەك، ڕووبەڕوویان بووبوونەوە و بەرەو ڕۆژهەڵات دەریان کردبوون) .

لە ساڵی (١٩١٧)، لە شاخی هەندرێن لە ڕۆژهەڵاتی ڕواندوز، شەڕێکی سەختی چەند ڕۆژە، لە نێوان ڕووسەکان لەلایەك و کوردەکانی دەڤەرەکە و تورکەکان لەلایەکی تر ڕوویدابوو، بە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ڕووسیا، ڕووسەکان پاشەکشەیان کردبوو و چەکدارە کورد و تورکەکان دوایان کەوتبوون و ژمارەیەکی زۆر لە هەردوولا کوژرابوون .

**نازەنین محمد  وهبی و ئەوانی دیکە:** (لە کاتی گەیشتنی هێزەکانی ڕوس بۆ دەوروپشتی کرماشان و خانەقین، عەشیرەتی سنجابی (سەنجاوی)، بەرگریەکی دلێرانەیان لە بەرامبەر لەشکری ڕووس کرد) .

**جەمال بابان:** (ماڵ نەما دەستی زۆر و ئەشکنجەی نەگاتێ، ماڵ و موڵك لەلایەن جندرمەوە بەبێ حیساب داگیر دەکرا).

**عەزیز قادر مەلەکی و مەغدید حوسێن مەلەکی:** (سەربازەکانی تورك، گوندی مەلەکانی خۆشناوەتییان سوتاندبوو) .

تورکەکان هەتاکو ساڵی (١٩٢٣) لە خۆشناوەتیدا دەستەڵاتدار بوون .

**عەلی قادر هەرمکی:** (جندرمە یان چەند سەربازێکی تورك، هاتبوونە گوندی مەلۆکی خۆشناوەتی و وێرانیان کردبوو) .

بە هۆی تۆمار نەکردنی زانیاری لە کاتی خۆیدا، ڕووداوی زۆر و پڕ بایەخ ونبوون، گەر تۆمارکرابان بۆ ئێستامان زانیاری بە سوود دەبوون، دەکرێت لە ئێستاشدا شتی شاراوە و تایبەت بەو ڕوداوە هەبێت، بەلاّم بەر چاوو گوێی ئێمە نەکەوتبێ .

**سەردار عەبدوڕەمان شێخوەسانی:** (لە کاتی گرانییەکەدا سەربازەکانی توورك پەلاماری گوندی شێخوەسانانی خۆشناوەتیاندا بوو،پیاو و کوڕە گەنجەکانی گوند، بەرەو شاخەکانی دەوروبەری هەلاّتبوون، سەربازەکان خانووەکانیان سوتاندبوون و ئاواییەکەیان بە وێرانکراوی بەجێ هێشتبوو).

**پەیسەر پرێس:** (ناوچە کوردییەکان بوونەتە گۆڕەپانی شەڕ و چەندین گوند و دێهات وێرانکراون) .

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** (وەك لە ڕاپۆرتی یەکێك لە ئەمریکیەکان هاتووە، لە ناوچەی کفری لە (٢٣١) گوند، (١٠٦) گوند خاپوور کران، بەشێکیشیان بە هۆی نەمانی ئاودێرییەوە چۆڵکران) .

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هۆکارێکی تری گرانی و قات و قڕی لە کوردستاندا، دەرەنجامی ئەو وێرانکاریانە بووە کە لەلایەن دەستەلاتی تورك و ڕووس، ڕوو بە ڕووی خەڵکی کوردستان بووەتەوە، تیایدا مەسیحیەکانی ڕواندوزیش زەرەرمەند بوون .

## پەراوێز:

تی.جەی.ئار، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، لاپەڕەکانی (٢١و٤٩).

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان....)، لە گۆگڵ ژمارەی ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١ بە دەستکارییەوە.

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەم) بەرگی یەکەم و دووەم،لاپەڕە(٥٢).

زوبێر رەسول چۆمانی، (گرانی بچوك و گرانی گەورە) لاپەڕەی تایبەتی خۆی، لە فەیسبوك، لە باسی باڵەکایەتیدا.

سەردار عەبدولرحمان حەسەن شێخوەسانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/٢٨ لە شارۆچکەی سەروچاوە.

ستار مەحمود مەحمود مەلەکی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٣/٤/١ لە گوندی کفرەدۆڵ.

شادمان مەلا حەسەن، (کورد سوتەمەنیەکی هەرزانی جەنگ)، لە فەیسبوك لە لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

عەبدولا حەمەدەمین یاسین توتمەیی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٩/٨/٩ لە گوندی توتمە.

عبدالرحمان عەلی عومەر مەلەکی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٣/٤/١ لە گوندی کفرەدۆڵ.

عەزیز قادر ئەحمەد مەلەکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٦/١١ لە کۆمەڵگای شکارتە. .

عەلی قادر عوسمان هەرمکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٧ لە گوندی مێرگەسەر.

فازڵ هاوردیانی، (هاوردیان) ،لاپەڕەکانی (٢٩ ـ ٣٠).

کامەران ئەحمەد محمدئەمین، (کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا)، لاپەڕە (١٠٧).

مەغدید حوسێن خدر مەلەکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٦/١١ لە کۆمەڵگای شکارتە.

محمد ئەمین زەکی، (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان) بەرگی یەکەم و دووەم،لاپەڕە (١٨١).

مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی، (ڕواندز باڵەك برادۆست) ،لاپەڕە(٢٦).

نازەنین محمد وهبی، عەتا عەبدوللا معروف، دارا محمد عبدولا، (مێژووی نوێ و هاوچەرخ ـ بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی) ،لاپەڕە (١١٤ ـ ١١٥).

## شەشەم: کوشتن و ئەتککردن بە ئەنقەست

کاتێ مێژووی گەلی کورد و کوردستان دەخوێنینەوە، زۆرن ئەو کارەساتانەی کە داگیرکاران، بە سەر خەڵکی ئەو وڵاتەیاندا هێناون، ئەو کاتانەی گەلی کورد و گەلانی تری کوردستان، لە توانایاندا نەبووە یان نەیانویستووە لە جەنگەکاندا بگلێن، یان لە کاتی پێنەدانی باج و سەربازدا، هاوکاری لایەنی شەڕکەریان نەکردووە، لایەنە شەڕکەرەکان، کارەساتی نامرۆڤانەیان بە سەر خەڵکی ئەو وڵاتەدا هێناون تا ئاستی کوشتن و ئەتککردن و...هیتر.

**نازەنین محمد وەهبی و ئەوانی دیکە:** (ڕووسەکانیش لە شارەکانی (وان، مهاباد، شنۆ)، قەسابخانەی گەورەیان خولقاند، هەروەها بەرەی خانەقین و کرماشان، شەڕی سەختی نێوان عوسمانییەکان و ڕووسەکانی بە خۆوە بینی، هەر یەکێکیش لەو هێزانە تۆڵەی شکستی خۆی لە کوردی ناوچەکەی دەسەندەوە و جووتیاری ناوچەکەی دەکوشت و زەویەکەی تالاَن دەکرد و ئاگری تێبەردەدا. هەر لەو ساڵانەدا ڕووسەکان لە ڕواندوز، قەسابخانەیەکی گەورەیان خوڵقاند، کە زیاتر لە پێنج هەزار کەسیان کوشت) .

**جەلیلی جەلیل و ئەوانی دیکە:** (لە ئەنجامی هەڵمەتی کۆچپێکردنی، ئەرمەنەکان بۆ ئۆردوگاکانی زیندان، لە بیابانەکانی سووریا، لەلایەن هێزەکانی تورکیاوە، بووە هۆی لە ناوچوونی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ئەرمەن، لە

ئەرمەنستانی ڕۆژئاواو ناوچەکانی دیکەی ڕۆژھەلأتی ئەنادۆڵ، تەنانەت کەس لەو کوشتارگەیە ڕزگاری نەبوو، تەنیا ئەوانەی توانییان بەرەو ڕووسیا هەڵبێن، یاخود بە هاتنی هێزەکانی ڕوسیا ڕزگاریان بوو) .

لێرەدا مەبەستی نوسەر زیاتر لە ئەرمەنیەکانی وان و دەوروبەریەتی لە باکوری کوردستان .

**شادمان مەلا حەسەن:** (لە ساڵی (١٩١٧)، سوپای عوسمانی تێکشکاو کوت و بەغدای جێهێشت، کاتێ بە سەر ناوچەی خانەقیندا گەڕانەوە، هەرچی پیاوی کەمێك جوان و ڕوخسار پڕ مابوو و دەستیان کەوت هەموویان کوشت! بە تۆمەتی ئەوەی ئەوان هاوکارییان ناکەن. لە ناوچەی بایەزید و شەلەشکورد لە سەدا دەی دانیشتوانی لە دەستی گروپە ئەرمەنی و سوپای ڕووس ڕزگاریان بوو) .

**مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی:** (لەساڵی (١٩١٦) لەسەردەستی سەربازەکانی ڕوسیای تزاری،خەڵکی ڕواندز ئەوەی کەوتە بەر دەستی ڕوسەکان،هەموویان کوژران و زۆر لە ژنان دەستدرێژی ناموسیان کرایە سەر،ئەوەی کەلەناوشاری مابونەوە و نەیانتوانی بوو خۆیان ڕزگاربکەن،لەشاخەکان و خەرەند و گەلی، خۆیان فڕێدایە خوارەوە لە ترسی ڕوسەکان) .

ئەوەی لێرەدا باسی لێوە کراوە و لەلایەن سەربازەکانی ڕووسیا ئەنجامدراوە، زیاتر لە هەڵس و کەوت و کردەوەی سوپایەکی میلیشیا دەچێت...

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** (عوسمانیەکان دوای ئەوەی بۆ ماوەی دوو مانگ مهابادیان گرتبوو، ڕووسەکان ویستیان بچنە ناو شار و دەریانپەڕێنن، هێزەکانی عوسمانی بەرەو بەرەی باشووری ڕۆژهەلاّت، بۆ گردی (داش مەجید) و چیای بووك و زاوا ڕۆیشتن، بەو جۆرە شار کەوتەوە دەست ڕووسەکان و کەوتنە ڕەشەکوژی ئەو خەلکانەی لە شاردا مابوونەوە، بە قەبلاّندنی هەندێك لە ئاگادارانی ئەو کاتە، ژمارەی کوژراوان لە نێو شاردا، گەیشتە سێ هەزار کەس. ڕووسەکان هەر کە گەیشتنە مهاباد، دەستیان کرد بە ڕەشەکوژیی خەلك، لە (٢٢) ی ئایار، کوردەکانی شنۆیان بە جۆرێکی وا بێ بەزەییانە لە ناو برد، کە ئیتر شنۆ نەیتوانی تا چەندین سالّی تر بێتەوە سەرخۆ. سەرباری کوشتاری ڕووسەکان، ئەرمەنەکانیش کە لە پێشەوەی سوپاکانیان بوون، لوت و گوێچکەی کوردانیان دەبڕی و هەتکیان دەکردن، بۆیە کوردی ڕۆژهەلاّت بە لێشاو، بەلووت و دەست یان مەمکبڕاوی، بە منالّی ساواوە ئاوارە بوون و خۆیان گەیاندە باشووری کوردستان، لەم لاشەوە سوپای توورکی موسلّمان ڕووتی کردنەوە. بە پێی ڕاپۆرتی (کاوریکا)، کە یەکێك بوو لە سیاسەتوانانی ڕوس، تورکەکان لە یەك هێرشی کتوپڕدا، دوو هەزار کوردیان کوشت. ناوبراو لەو بارەیەوە نوسیویەتی: تورکەکان سکی پیاوانیان هەلّدەدڕی و مەمکی ئافرەتانیان دەبڕی، تەنانەت بە زەییان بە کچۆلّە ساواکانیش نەدەهاتەوە. وەك عبدلعزیز یامولکی ئێژێ: بە درێژایی ڕێگای نێوان کرماشان و خۆرئاوای خانەقین، لاشەی جوتیارە کوردەکان کە بە دەستی تورکەکان کوژرابوون، لەم لاو لەولای شەقامەکە فڕێدرابوون) .

لێرەدا زەینمان بۆ ئەوە دەچێت، سوپای ڕووس و سوپای عوسمانی، بە مەبەستی قڕکردن کەوتبنە گیانی خەلکی بێ چەکی هەژاری کورد، بەلاّم ئەوەی زیاتر سەرنجمان ڕادەکێشێت، هەسوکەوتی نەشیاوی ئەرمەنیەکانە بەرامبەر بە کوردەکان، دەکرێ ئەوان ڕق و کینەی سوارەی حەمیدیەیان لەو کاتەدا لە کورد دەرکردبێت .

**ئیحسان ڕەشاد موفتی:** (لەلایەکی دیکەوە مالّ لە خۆی نەبوو، ئینجا سوپای ڕووسی پێش دۆستەکانیان لە شەڕی ئینگلیز، هاتنە ناو خاکی کوردستان، گەیشتنە ڕواندوز و دەوروبەری ئامێدی زۆر دڕندانە هەلّسوکەوتیان دەکرد، مندالّی ناو بێشکەیان دەکوشت) .

**تارق جامباز:** (لە سالّی گرانی کوشتن زۆر بوو، بەلاّم ناوچەی ئێمە لە هەموو جێگایەك باشتر بوو، چونکە خەلّك زۆر حیسابیان بۆ شێخی دەکرد و ڕێزو تەقدیریان دەگرت) .

لێرەدا مەبەستی لە ناوچەی بالّەکایەتی و دەڤەری سۆرانە، وە سەبارەت بە (شێخ)، مەبەستی لە (شێخ کاکەمینی سەرانە)، ئەو کەسایەتیەکی دینداری موسلّمان بووە .

## پەراوێز:

ئیحسان رەشاد موفتی، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر ـ مێژووی کۆن، مێژووی ئیسلام، مێژووی نوێ) لاپەرە (١٣٢٩).

تارق جامباز، (ناودارانی دەفەری سۆران ـ شێخ کاکەمینی سەران ١٨٧٤ ـ ١٩٤٠)، لاپەڕە (٣٢).

جەلیلی جەلیل، م.س.لازاریف ، م.ا.حەسرەتیان، شاکرۆ محۆیان، نۆلگا جیگالینا، (شۆڕشەکانی کورد لە سەردەمی نوێدا) لاپەڕە (١٤٠).

شادمان مەلا حەسەن، (کورد لە نێوان دوو بەرداشی سوتێنەردا و کورد سوتەمەنیەکی هەرزانی جەنگ). لە فەیسبوك لە لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین، (کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا)، لاپەڕەکانی (٩٤ ـ ١١٣).

مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی، (رواندز بالەك برادۆست)، لاپەڕە (٢٦).

نازەنین محمد وهبی، عەتا عەبدوللا معروف، دارا محمد عبدولا، (مێژووی نوێ و هاوچەرخ ـ بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی) لاپەڕە(١١٤ ـ ١١٥).

## حەوتەم: چۆڵکردنی زێد، دەرکردن و ڕاگواستن

بە درێژایی مێژوو، خەڵکی زوربەی شارو شارۆچکە و گوندەکانی کوردستان، بە دەیان و بگرە بە سەدان جاریش ڕووبەڕووی دەرکردن و ڕاگواستن بوونەتەوە، زۆرن ئەو گوند و شارو شارۆچکانەی کە چەندین جار ئاوەدان کراونەتەوە و دواتر بە هەر هۆکارێك بێت چۆڵکراونەتەوە، زۆرن ئەو وڵاتانەی کە چەند بنەماڵەیەکی کوردی تیادا نیشتەجێیە، هەیانە سەدان ساڵە لە کوردستان ڕاگوازراون و کەلتوور و زمانی ئەویّ فێربوون .

**نازەنین محمد وهبی و ئەوانی دیکە:** (عوسمانییەکان و ڕووسەکان و ئینگلیزەکان و ئەڵمانیەکان و ئێرانیەکان، بە هۆکاری سەرەکی سەرجەم ئەو کارەساتانە دادەنرێن، هەرچەندە عوسمانیەکان و ڕووسەکان ڕۆڵی سەرەکیان هەبوو لەم بوارەدا، تەنانەت شوێنی دانیشتنی چەندەها عەشیەت لە کوردستان گۆڕاوە و چەندەها عەشیەت بۆ دەرەوەی کوردستان ڕاپێچ کراون. دوای داگیرکردنی (ڕەزاییە ـ ئورمیە) لەلایەن عوسمانیەکانەوە، ساڵێکی نەخایەند عوسمانیەکان لە بەرەی باکوری کوردستان لە شەڕی (ساری قامیش) لە بەرامبەر ڕوسەکاندا، ڕوبەڕوی شکستێکی گەورە بوونەوە، ئەنجامی ئەو شەڕە ئەوە بوو، ڕووسەکان پێشڕەویان کرد بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی (قارس و ئەرزەڕۆم و ئورمیە و موکریان و ڕواندز و پێنجوێن و خانەقین)، عوسمانیەکان لە کاتی پاشەکشەیاندا، ڕەشبگیر کەوتنە

گیانی، خەڵکی مەدەنی کوردستان و هەر بە بیانوی شەڕەوە زیاتر لە (٧٠٠٠٠٠) کەسیان لە کوردستان گواستەوە بۆ خۆر ئاوای ئەنادۆڵ، بە مەرجێکیش نابێ لەوێ لە (سەدا پێنج) ی دانیشتوانی زیاتر بن و جگە لە زمانی تورکیش نابێ بە هیچ زمانێکی تر قسە بکەن) .

**ساڵح قەفتان:** (عوسمانییەکان، کوردەکانیان لە کوردستانی تورکیاوە ئەبرد بۆ خۆر ئاوای ئەنادۆڵ، بۆ ئەوەی هۆشی نەتەوایەتییان لە بیر بچێتەوە) .

ڕاگواستن و لە بیربردنەوەی هۆشی نەتەوەیی و زمان و کەلتوری کوردی، لەلایەن دەستەڵاتی تورکەوە، هەتاکو ئێستاش هەر بەردەوامە .

**لازاریفـن:** (باسی ساڵی (١٩١٥ ـ ١٩١٦) ی کردووە کە دەستەڵاتداران بە پێی مەرسومێکی سوڵتانی دەستیان کردووە بە ڕاگواستنی کورد لە ناوچەکانی دەوروبەری بەرەکانی شەڕ بەرەو ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ بەرێژەی (١٠) کورد بەرامبەر بە (١٠٠) تورك. لە ماوەی ساڵەکانی شەڕ، نزیکەی (٧٠) هەزار کورد، لە کوردەکان ڕاگواستران. لە بەهاری ساڵی (١٩١٥)، دەستەڵاتی تورکیا دەستی کرد پرۆسەی پاکتاوکردنی بە کۆمەڵ، لە دژی دانیشتوانی ئەرمەنی، بە بیانوی گواستنەوەیان لە مەیدانی ئۆپراسیۆنە سەربازیەکان، بۆ گرتوخانەکان لە سوریاو ولاّتی دووزێ (بلاد الرافدين). کە باس لە کوشتنی نزیکەی ملیۆن و نیوێك لە ئەرمەنیەکان دەکرێت. لە ئەنجامی ئەو پرۆسەیە و پرۆسەکانی دواتر، ڕۆژهەلاّتی تورکیا ڕوو بەڕووی پاکتاوکردنی ڕەگەزی ڕادیکاڵی بووەوە، لە دانیشتوانی ئەرمەنی، ئەوانەی کە زۆر لەمێژەوە لەو ناوچانە نیشتەجێن. ئاشوریەکانیش

قوربانیەکی تری ئەم پاکتاوکردنە بە کۆمەڵەن، ئەوانەشی کە ناچار بوون لە شوێن و جێگای خۆیان لە هەکاری هەڵبێن بەرەو ئێران (ناوچەی دەریاچەی ئورمییە)، لە ترسی کۆمەڵکوژی، لەسەر ڕێگا توشی زەرەر و زیانی گیانی زۆر هاتن، کە بە دەیان هەزار هەژمار دەکرێت) .

جگە لە کوردەکان، ئەرمەنی و ئاشوریەکانیش، بوونەتە قوربانی ململانێی دەستەڵاتی تورك و ڕووس .

**محمد ئەمین زەکی:** (لە ئبتیدائی شەڕی گەورەدا وە بە نەزەر دەفتەری مودیریەتی عمومی موهاجرین، (٧٠٠٠٠) کورد لە وەتەنیان هەڵگیاون و براونە ولاتی غەربیی ئەناتول، وە زوربەیان لە ڕێگا لە هیلاکی و برسیەتی و نەخۆشی مردون. بێجگە لەمە ئۆردوی دووەم، کە لە ساڵی سێیەمی حەربدا، لە دیاربەکر گردبووەوە، لە پایزی ساڵی ١٩١٧دا، بۆ خاتری ئەمە کە ئیعاشەی خۆی تەئمین بکا، وە خۆراك خۆری غەیرە عەسکەر لەو ناوەدا نەهێڵێ، هەموو خەڵکی ئەو ولاتی دیاربەکر و موش و بەتلیسەی دەرکرد. بەعزێ لەو بەسەزمانانە ڕوویان کردە موسڵ و بەعزێکیشیان سەوقی ئەتنە و حەلەب کران) .

**محمد رسول هاوار:** (باس لەوە کراوە کە ڕێکخراوێکی تورکی بەناوی (العروە الوثقی والتقدم) لە ساڵی (١٩١٥) سوڵتانی ناچار کردووە کە چەند فەرمانێك دەربکات بۆ ئاوارە کردنی کورد بۆ ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ بۆ ئەوەی لە ناو تورکەکاندا بتوێنرێنەوە بەو جۆرە (٧٠٠) هەزار کورد ئاوارە کران. دەزگای سەرکردایەتی

گشتی، بۆ سەرپەرشتیکردنی ئاوارەکان، لە ساڵی (١٩١٥)، بە ئاشکرا دانی بە ئاوارەکردنی (٧٠٠) هەزار کوردا ناوە،کە لە کوردستانەوە گوێزرابوونەوە بۆ ڕۆژئاوای تورکیاو ژن و منداڵیان لە گەورەکانیان جیا کردبوەوەو هەر وەکو دیل و بەند ڕفتاریان لە گەڵدا دەکردن و برسیەتی و نەخۆشی کارێکی وای کردبوو بە سەلامەتی ئەو گوێزراوانە، نەدەگەیشتنە ئەو شوێنەی بۆیان دەستنیشان کرابوو).

هەڵسوکەوت و بیری توندڕەوی تورك، دژی کورد و ئەرمەنەکان، لەو کاتەوە توند تر بوو کە چەند ڕێکخراوێکی نەتەوە پەرستی تورك، لە سەرەتای ساڵانی (١٩٠٠) سەریان هەڵداو دەستەلاتی سوڵتانیان لاواز کرد .

**جەلیلی جەلیل و ئەوانی دیکە:** (لە میانی ساڵانی شەڕدا، نزیکەی (٧٠٠) هەزار کورد ئاوارەکراو نیوەی ئەو ژمارەیەش لەڕێگادا مردن. بە گوێرەی شایەتحاڵان ئەو زەویانەی کەوتبوونە باشووری ڕۆژئاوای دەریاچەی وان، کە پێشتر (٨٠٠) هەزار کوردی تیادا دەژیا، بە یەکجاری چۆڵکرا. دوا بە دوای دەست بەسەرداگرتنی ناوچەی وان لەلایەن هێزەکانی ڕووسیاوە، هێزەکانی تورکیا لە بەهاری ساڵی (١٩١٥)، دەستی کرد بە هەڵمەتێکی کۆچپێکردن، بە کۆمەڵی ئەرمەن بۆ ئۆردوگاکانی زیندان، لە بیابانەکانی سوریا ولاتی ڕافدەین، بە بیانوی خۆ سازدان بۆ هەڵگیرساندنی ڕاپەڕین. چەندین کارەساتی گەورەش ڕووبەڕووی ئاشووریەکان بووەوە، ئەوانەی لە کەرتی هەکاریدا دەژیان، لە ئاکامدا بەرەو

باکوری رۆژئاوای ئێران هەلاتن (ناوچەی دەریاچەی ورمێ)، لە ترسی هێزەکانی توركیا، دوای ئەوەی لە ڕێگادا زیانێکی زۆریان پێ گەیشتبوو) .

بەرلەوەی جەنگی یەکەم سەرهەلبدات، باکوری کوردستان لانکەی پێکەوە ژیانی (کورد و ئەرمەن و ئاشور) بووە .

**واسیلی نیکیتین:** (ڕاستییەکی زۆر گرنگی تر،کە تێکرای خەڵك لیی بێ خەبەر ماون و نابێ بێ دەنگی لێ بکرێ،دوورخستنەوە و هەڵ داشتنی دەستە جەمعی کوردانە،لە ماوەی شەڕی(١٩١٤ ـ ١٩١٨) ،ئەو فرێ دانانە بە بیانوی چۆڵکردنی شوێنەکانی سەر ڕێی هێزی ڕوسیا بوون،بەلاّم مەبەستی سەرەکی جیاکردنەوە و دورخستنەوەی کوردان لە هەستی نەتەوایەتی بوو،کە لە دێهاتی تورك نشیندا بلاّویان دەکردنەوە و لە سەرۆکەکانیان دوریان دەخستنەوە،لەو(حەوت هەزار)کەسەی دورخرابوونەوە،ژمارەیەکی زۆریان تێداچوون و ئەوانی مابوون گەڕانەوە سەر جێگاو ڕێگای خۆیان) .

لێرەدا سەبارەت بە ڕاگواستنی خەلکی کوردستان، لە زێدی باب و باپیرانیانەوە، چەند ژمارەیەکی جیاوازمان بەرچاو دەکەوێت، بۆ دلنیابوون لە ژمارەی تەواوی ڕاگوێزراوان، هەوڵ و ماندوبوونێکی یەکجار زۆری دەوێت، کە لە توانای ئێمەدا نی یە، وە ڕەنگە بە ئەنجامیش نەگەین .

**دابلیو.ئارهێی:** (لەو سێ هەزار کەسەی، کە لەو شارە دادەنیشتن، هەزاریان شاریان بە جێ هێشتووە، ئەوی دیکەی، ئەوەی لە برسان مردون و ئەوەی ماوە خەڵکانێکی پۆخڵ و بەدبەخت بوون) .

لێرەدا باسی شاری (ئاڵتون کۆپری) دەکات، لە باشوری کوردستان لە سەردەمی گرانیەکەدا، لەو هەزار کەسەی شاریان بەجێ هێشتووە، دەکرێ بەشێکیان لە برسان مردبن .

**ئی.جەی.ئارڕ:** (کاتی هەڵکشانمان بەرەو دیالە و پاشەکشەی تورك بۆ ڕۆژئاوای ئەو ڕوبارە، کوردانی ناوچەی کفری، ولاتیان کەلەلایەن هێزەکانی عوسمانییەوە داگیر کرابوو، چۆڵ کرد و ڕازیش نەبوون ئازوخەیان بدەنێ، بەو هیوایەی کە ئێمە بە زووترین کات، سەرتا سەری ناوچەکە تا خانەقین داگیر بکەین) .

ئی.جەی.ئارڕ، خۆی لەنێو ڕوداوەکاندابووە و بەرپرسێکی پلە بالأی ئینگلیز بووە .

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** (کوردەکان کە ولاتەکەیان ببووە گۆڕەپانی جەنگ، بە تەنیا لە دەست هێرشی ڕوسەکان نەیانناڵاند، کە بەو پەڕی بەدییەوە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکردن، بگرە تورکەکانیش لەوان کەمتریان پێ نەدەکردن، دوای ئەوەی بەرامبەر ڕووسەکان خۆیان نەگرت و ناچاری پاشەکشێ بوون. ڕەشبگیر کەوتنە گیانی خەڵکی بێتاوانی کوردستان و داخی شکانەکەی خۆیان بەوان هەڵڕشت.

عەبدولعزیز یامولکی لەو بارەیەوە نووسیویەتی: سوپای تورك کە ناچاربوو بە شکاوی ئەرزەڕۆم جێ بهێڵێ هەڵیپێچایە سەر کوردەکان و بە خاوخێزانەوە ڕایگوێزانەوە ئەناتۆلیا. وەك لە یەکێك لە بەڵگەنامە ڕسمیەکاندا هاتووە: دەبێ

خەڵکی ناوچە پڕدانیشتوانە کوردنشینیەکان ڕاگوازرێن لە وڵاتی خۆیان دووربخرێنەوە و لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بکرێن کە تورك نشینن، بە مەرجێك ڕێژەیان لە ٥٪ سەرجەم خەڵکانی تورکی ناوچەکان زێتر نەبێت، منداڵ و لاوان لەگەڵ خۆیان بەرن و نابێ تێکەلاوی یەکتربن. هەموو جۆرە پەیوەندی و تێکەلاویەکیش دەبێ بپچڕێ) .

کوردەکان نیشتیمانی خۆیان خۆشویستووە، هەرکاتێك دەرفەتیان بۆ ڕەخسابێت، گەڕاونەتەوە کوردستان . ئەو هەموو کارەساتانەی بەسەر نەتەوەی کورددا هاتوون، بەسەر هەر نەتەوەیەکی تردا هاتبان، شوناسی نەتەوەیی خۆی لە دەست دەدا . کوردستان خاکێکی هێندە بە پیتە، لە ڕابردوو لە ئێستاشدا چاوی چڵێسی داگیرکارانی هەر لەسەر بووە و لە ئێستاشدا هەر لە سەرە .

## پەراوێز:

ئی.جەی.ئار، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، لاپەڕە (١٤).

جەلیلی جەلیل، م.س.لازاریف ، م.ا.حەسرەتیان، شاکرۆ محۆیان، ئۆلگا جیگالینا، (شۆڕشەکانی کورد لە سەردەمی نوێدا)، لاپەڕە (١٤٠ و ١٤٢).

دابلیو.ئارهێی، (دوو ساڵ لە کوردستان)، لاپەڕە (١١٢) .

ساخ قەفتان، (مێژووی گەلی کورد و نەتەوەی کورد تورکمان نییە) لاپەڕە (٢٩٥).

کامەران ئەحمەد محمەدئەمین، (کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا)، لاپەڕەکانی (٩٧ و ٩٨).

لازاریف.ن، (مێژووی کوردستان) لاپەڕە (٢٩٨ و ٣٠٠).

محمد ئەمین زەکی، (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان) بەرگی یەکەم و دووەم لاپەڕە (١٧٩).

محمد رسول هاوار، (کورد و باکوری کوردستان) لاپەڕە (٥٤٩ و ٥٥٠).

نازەنین محمد وهبی، عەتا عەبدوللا معروف، دارا محمد عبدولا، (مێژووی نوێ و هاوچەرخ - بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی ڕێژەیی) لاپەڕە(١١٤ و ١١٥).

واسیلی نیکیتین، (کورد و کوردستان) لاپەڕە (٥٧٠ و ٥٧١).

## هەشتەم: نەبوون یان کەمی خوێ

وتەیەکی کوردی هەیە دەڵێن: (هەموو شتێك بە خوێ، خوێش بە مانا)، لێرەدا مەبەست لەوەیە: هیچ چێشتێك بە بێ خوێ ناخورێت، بەڵام دەبێت بە پێی پێویست خوێی تیادا بکرێت، ئەگەرچی ئەو وتەیە، تایبەت بە گرانی گەورە نەگوتراوە، بەڵام بۆ ئەوە هێناومانەتەوە، لە سەردەمی گرانیەکەدا، لە کوردستان ئەگەر خواردن هەشبووبێت خوێ نەبووە یان زۆر کەم بووە. بابزانین ئاخۆ ئەگەر بۆ ماوەیەك مرۆڤ خوێ نەخوات، دەتوانێت بەردەوام بێت لە ژیان؟.

**تاهیر احمد حەوێزی:** (زۆر کەس کەنگری دەکوڵاندو پێی دەژیا، بەڵام لەبەر بێ خوێیی خەڵك تامەزرۆیان دانەدەکەوت، چەشنە خاکێکیان لە ئاوێ دەکرد، هەویریان پێ دەشێلا. لەلای گوندی تاڵەبان، لەشاخی کرێژی، خوێیان لێ دەکردەوەو بەکاریان دەینا، وە لەگوندی مەرزان، ئاوەکەی سوێر بوو ئیشیان پێ دەکرد. ئەم گرانی یە، زۆر شوێنی گرتبۆوە، لە (ڕانیە) کە تۆڵەگەیان بەبێ خوێ دەکوڵاند، لە پاش خواردن ئەستوور دەبوون و دەمردن).

خوێ مادەیەکی سروشتییە، زیاتر لە ئاوی سوێر، لە کەنار دەریاچەکان لە سەر ئاو کۆدەبێتەوە.

**فازڵ هاودیانی:** (لەو ساڵەدا خوێ نەبوو، خەڵکی زمانیان ئەستوور دەبوو دەمردن).

**عومەر فەقێ ئەحمەد شێخوەسانی:** (پێش سەرهەڵدانی برسیەتیەکە، باپیرم لە گوندی شێخوەسانی خۆشناوەتی بە کورەکانی گوتبوو: بڕۆن، هەرچەند دەستتان دەکەوێت خوێ بکڕن، چونکە هیچ شیو (چێشت) ێك بە بێ خوێ ناخورێت، ئەگەر ناچاریش بین بیخۆین، توانای کارکردنمان نابێت) .

لە خۆشناوەتیدا خوێ بەرهەم نەهاتووە، دەبوایە بچن لە شوێنە دوورەکان بیهێنن، لە گواستنەوەشدا زۆر قورس بووە، ئەوکات هۆکاری گواستنەوە لە کوردستان بە گشتی و خۆشناوەتی بەتایبەتی وولاغە بەرزە و گوێدرێژ بووە، ڕەنگە خەڵك نەیانتوانیبێت لە گوند و ناوچەکەی خۆیان دوربکەونەوە، بە مەبەستی کڕینی خوێ و خۆراك .

**حەلیمە شێخ کەمال سەرانەیی:** (لە گوندی سەرانی نزیك ڕواندوز، خەڵك پەنایان بۆ بەر خواردنی گژوگیای بەهاری بردووە، بەلاّم بە هۆی نەبوون یان کەمی خوێ، زۆریان مردون) .

**سلێمان ئیسماعیل ئاندێکی:** دایکم ناوی (ئایشە) بوو، دەیگێڕایەوە: (ساڵی گرانی، خوێ بە ئەستەم دەست دەکەوت، یان هەر نەبوو، ئێمەی خەڵکی گوندی ئاندێکی خۆشناوەتی، (ئەسریشك) مان وورد دەکردن و بۆ هەر ژەمێك پارچەیەکمان، لە نێو شیو (چێشت) دەکرد، بۆ ئەوەی سوێربێت) .

لە بەشی فەرهەنگۆك، باسی ئەسریشکمان کردووە . زۆرن ئەوانەی باس لە نەبوون یان کەمی خوێ دەکەن و پێیان وایە هۆکارێك بووە بۆ بێ هێزبوون و مردنی خەڵك . ئێمە لێرەدا زانیاری پزیشکیمان وەرگرتووە کە لێرەدا دەیخەینە ڕوو وەکو:

خوێ پێویستە بۆ (مێتا بولیسم) ی لەش و هەروەها بۆ ڕاگواستنی پەیامەکانی تورەیی لە مێشکدا و بۆ کاراکردنی ماسولکەکان، بە پێی پێشنیاری ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی، ڕۆژانە تا پێنج گرام بۆ یەك کەس ئاساییە، هەروەها (تۆلێرانس) دروست دەکات لە بەرانبەر (ئەنسۆلین)، بۆ ئەو کەسانەی کێشەی دڵیان هەیە تاڕادەیەك پێویستە، وە شتێك هەیە پێی دەڵێن (هیپۆنا تێرمیا) کە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی زۆری خوێی خوێن، ئەگەری ئەوە هەیە مێشك توشی کێشە بێت، بۆیە تاڕادەیەك پێویستە .

## پەراوێز:

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم،لاپەڕە (١٣٢ و ١٣٣)، لەباسی شاری کۆیە.

حەلیمە شێخ کەمال سەرانەیی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٥/٢/٢٠٢٠ لە شاری هەولێر.

سلێمان ئیسماعیل حمد ئاندێکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ١٤/١/٢٠٢٠ لە گوندی ئاندێك.

عومەر فەقێ ئەحمەد شێخوەسانی، چاوپێکەوتن لە ١٥/٩/٢٠١٢ لە بالیسان.

فازڵ هاوردیانی، (هاوردیان)، لاپەڕەکانی (٢٩ ـ ٣٠).

## نۆیەم: ڕووداوە سروشتییەکان

کوردستان یەکێکە لەو ولاَتانەی، کە زوربەی کشتوکاڵ و ڕووەکە سروشتییەکانی، بە هۆی بارینی بەفرو بارانی زۆر دەهێنە بەرهەم، سەرچاوە ئاوەکانیشی هەر بە هۆی بارینی بەفروبارانەوە زیاد دەکەن .

**رفیق حلمی:** (ڤینی تەبیعەتیش بوو بە سەربار، لەم ساڵەدا کە بەهۆی شەڕەوە، چاندنی تۆوی دەغڵودان و کاروباری فەلاحەت و جووتیاری، بەدەس پیرو پیرەژن و پیرەمێردە بێ هێزەکانەوە مابوو، بارانیش چووە بەست، وە هەروەکو خەڵکەکە بە چارپێکەوتنی، یەك لە سەر یەکی دەرد و بەلاَ ڕاهاتبوون و دڵیان ڕەق بووبوو، دڵی ڕەقی تەبیعەتیش نەدەهاتە جۆش، وەهیچ نەبێ بۆ ڕزگارکردنی هەژارە بێتاوانەکان لە برسییەتی و نەخۆشی، فرمێسکێکی نە ئەڕژاند، بەڕادەیەك کەوا ئەهات بەبیرا ئەم کەونە دڵڕەقە ئاوێکی تیا نەبێ. نەك نێرینە، بەڵکو ژنە کەساسەکان و کچە جوانکیلەکانیش، کە ڕوتوقوت مابوونەوە، لەشیان بۆ دانەدەپۆشراو بەتەنگ شەرمەوە نەمابوون، ئینجا سەرەتای زستان دەرکەوت، بەلاَم زستانێکی سەخت و بە پێچەوانەی فەسڵی دەغڵودان، زستانێکی ئێجگار ساردوسۆڵەو بەباران، ئیتر ئەوانەی کە خوا پارووییێك نانیشی دابوونێ و بە کولەمەرگی سکیان تێر ئەکرد، لەبەر هاوارو نوزەی بێ هێزو دەنگی پاڕانەوەی ژن و مناڵ و پیرەمێردە نەخۆشەکانی دەستوپێ ئاوساو، کە لە ژێر باران و ڕەشەبا

و سەرمای زەمهەریری شەوانی زستانا ،لە کۆلاَنەکانەوە ئەهاتە بەرگوێ، ئارامی لێ ئەبڕاو بەبێ دەستەلاَت دەستی ئەکرد بە گریان) .

**پەیسەر پریس:** (لە سالّی (١٩١٦) ، برسیەتییەکی گەورە شاری موسڵی گرتەوە، ئەو برسیەتیەش لەوەوە سەرچاوەی گرت، کە ئەو ساڵە باران کەم باری، ئەوەش وایکرد کە وەرزی کشتوکاڵی بە بێ بەرهەم بێنێتەوە . لە سالّی (١٩١٧)، بە پێچەوانەی سالّی پێشوو، کە وشکە سالّی بوو، ئەو ساڵە پڕبوو لە بەفرو سەرماو سۆڵە ، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی زۆرینەی ئەو ئاژەلاَنەی مابوونەوە مردار ببنەوە . لە هەمان سالّدا ، ڕەوە کولەی زۆر ناوچەکەی داپۆشیبوو، بە شێوەیەك بە دەگمەن خەڵك بەرهەمی کشتوکاڵییان بۆ دەرچووبوو) .

وشکە سالّی و سەرماو سۆڵە و ڕەوە کولە، بە هۆیانەوە نەك هەر مرۆڤ، بەڵك و ئاژەڵیش دوچاری برسیەتی بوونەتەوە .

**جەمال بابان:** (بارانیش بڕا و بەروبوم نەما) .

**محەمەد عەبدولا سەرسیانی:** (کات نێوان وەرزی زستان و بەهار بووە،خەڵکی گوندی سەرسیانی بەری مەرگە ،خاوەن ئاژەڵ بوون،ئەو کات(سەرانگوێلك ـ قوبە زبلّی ئاژەڵ)ی زۆری لێبوون،خەڵکی ئاوارە لە سەرمان چاڵیان لە نێو قوبە زبڵەکاندا هەڵکەندون و چوونەتە ناوێ،بە مەبەستی خۆ پاراست لە سەرمان،چونکە نێو زبڵەکە گەرم بووە،وە هەندێکیشیان دەرگای خانوی ئاژەڵەکانیان کردونەتەوە و چونەتە تەویلە و کادینەکان) .

**فازڵ هاودیانی:** (لەو ساڵانەدا وشکە ساڵی بوو، خەڵك زۆربەیان ڕوویان لە چیاکان و ئەشکەوتەکان کرد) .

لە چیاکاندا لە وەرزی پایز بەروبوومی درەختی خۆڕسك هەبووە، ڕەنگە خەڵکەکە بە مەبەستی خواردنی ئەو بەروبوومان، ڕوویان لە چیاکان کردبێت و لە ئەشکەوتەکاندا ژیابن .

## پەراوێز:

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان....)، لە گۆگڵ، لە ژمارەی ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١، لێرەدا بە دەستکارییەوە کورتەیەکی لێ وەردەگرین.

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەم) بەرگی یەکەم و دووەم لاپەڕە (٥٢).

رفیق حلمی، (یاداشت)، بەشی یەکەم لاپەڕە ( ٣٠ و ٣١).

فازڵ هاوردیانی، (هاوردیان)، لاپەڕەکانی (٢٩ ـ ٣٠).

محەمەد عەبدوڵا خدر سەرسیانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠٢٠/١/١٢ لە شارۆچکەی سەروچاوە.

دەرهاویشتەکان زۆرن و هەوڵدەدەین یەك لە دوای یەك، بە پێی توانا باسیان بکەین، ئەوەی لێرەدا تۆمارکراوە، چەند نموونەیەکی ئەو ڕوداوو کارەساتانەن، کە بەسەر خەڵکی کوردستاندا هاتوون ...

## یەکەم: هەڵگرتن و حەشاردانی خۆراك

لە کوردستاندا بە هۆی سەرماو بەفرو بارانی زۆر، لەوەرزی زستان کشتوکاڵ بەرهەم نەهێدراوە، خەڵکەکەی لە وەرزی هاوین و پایزدا مشوری خۆیان خواردووە و خۆراکی زستانیان هەڵگرتووە، لە کاتی گرانیەکەدا حەشاردان یان بابڵێین: شاردنەوەی خۆراك بۆچی ؟ .

**تاریق جامباز:** (ساڵی گرانی ئەو کەس کە حەیواناتی هەبا وەزعی باش دەبوو، خەڵك بە مەڕ و مالاَت باشتر دەژیان، خەڵکیش ئەوەی شتی خواردنی هەبووایە، لەترسی حوکمی تورکەکان کە دەیەکیان لە خەڵك دەسەند، دەیانشاردەوە) .

جاروابووە زیاتر لە دەیەکیان لە خەڵك ستاندووە، هەروەکو لە بەشی ستاندنی باجدا باس کراوە .

**خالید حەمەدەمین هەرمکی:** (خەڵکی گوندی هەرمکی خۆشناوەتی، لە ترسی جندرمەکانی توورك، لە شاخەکانی دەوروبەری گوند دانەوێڵەیان حەشار دابوو).

**مەلا ڕسول حەمەد وەرتی:** (خەڵکی گوندی وەرتێی باڵەکایەتی، لە وەرزی هاوین و پایزدا، لەتکە کرۆسك و لەتکە هەنجیر و چەقەڵەو گوێزو و مێوژ و بەڕو....هیتر.

بۆ زستان هەڵگرتون، بۆیە برسیەتی کەمتر کاری لە خەڵکی گوندەکە کردووە، بەڵکوو ئەوانەی لە برسان مردون، زیاتر خەڵکی پەناهەندە بوون) .

لە خۆشناوەتیدا خەڵکی گوندنشین نەریتیان بوو، پێش هاتنی وەرزی پاییز، هەموو پێداویستیی ئەو شەش مانگەی پایز و زستانیان دابین دەکرد، لە گەنم و جۆو لەتکە کرۆسك و لەتکە هەنجیر و چەقەڵەو گوێزوو مێوژ و بەڕوو...هیتر . لە کاتی گرانیەکەدا بەشێك لەو خێزانانەی کە لە برسان نەمردون، بە هۆی خواردنی مێوژ بووە، خێزانی وا هەبووە دوو تا سێ هەنبان مێوژی هەبوون، لەلایەن سەرۆکی خێزانەکەوە بۆ هەر ژەمێك یەك مشت مێوژ دراوەتە هەر ئەندامێکی خێزانەکە و خواردوویانە و بەو هۆیەوە لە برسییەتیەکە دەرباز بوون .

**لی‌جەی‌ئار:** (ئەوانە دانەوێڵەی هەڵگیراوی خۆیان لە گردە نزمەکاندا شاردبۆوە و دواتر ناچاربوون و دەبوو یا ئاشکرایان بکەن یان لە برساندا بمرن) .

لێرەدا باسی ساڵی ۱۹۱۷ دەکات و مەبەستی لە خانەقین و کفری و دەوروبەریەتی.

**محەمەد عەبدولا سەرسیانی:** (خەڵکی گوندی سەرسیانی بەری مەرگە، لە دەوروبەری گوندەکەیان، چاڵەگەنمیان داکردبوون، دواتر جندرمەکانی توورك هاتبوون و گەنمەکەیان دەرهێنابوو و بۆ خۆیان بردبویان) .

**ئیحسان رەشاد موفتی،** لە سەرزاری ژنێك بەناوی (حاجی زولەیخا)، نووسیویەتی: (کە گرانی باری قورس بوو، چاڵی گەنمان هەبوو هەڵماندەکەند، بۆ ئەوەی تۆی چاندنی ساڵی دابێ و ئازووقەی ساڵێکی لێ حەشار دەین و بیپارێزین، بەڵام لە

گرانیی ئەو گەنمەی نێو چاڵەکە بە شەو دەچووین و دابەشمان کردە سەر شەش حەفت چاڵی بچووك دوور لە یەکتر، لە مەترسی ئاشکرابوونی و ئێمەش ببینە سواڵکەر، جندرمەی تورك دەسوڕانەوە لە گوندەکانی دەوروبەری شاری هەولێر و لە مزگەوتی قۆریتان دەخەوتن هاواریان دەکرد (ئەجەم) وە (ئەکمەك)، بە مەعنای (برسیمە)یەکەمیان و دووەمیان (نان).....) .

دابەشکردنی گەنمەکە بۆ چەند چاڵێك، ڕەنگە مەبەستیان ئەوە بووبێت ئەگەر ئاشکراش ببێت، یەك چاڵ یان چەند چاڵێکیان لە دەست بچێت، باشترە لەوەی هەموو چاڵەکان ئاشکرابن و لە دەستیان بچن . سەبارەت بە هاوارکردنی جندرمەکانی تورك لە برسان، هۆنراوەکەی مەلا حەمدونمان بیر دەکەوێتەوە، کە لە نیوە دێڕێکدا نوسراوە: (ژەندرمە ئەسوڕێتەوە وەك واشەیی برسی ...)، ئەو هۆنراوەیەمان هەمووی لە بەشی هۆنراوە خستووەتە ڕوو .

**حەسەن مستەفا بەگ توتمەیی:** (جندرمەکانی تورك، هەرچی چاڵی دەنەوێڵەی نێو گوندی توتمە هەبوو، دۆزیانەوە و دانەوێڵەکانیان بە تاڵان بردن، دواتر خەڵکی گوند، لە ترسی جندرمەکان، گەنم و دانەوێڵەکانی تر کە مابوویان، لە دەرەوەی گوند، لە نزیك گۆڕستانی (شێخ نوورەدین) لە چاڵی ژێر زەویدا دەشاردەوە) .

## پەراوێز:

ئی.جەی.ئارپ، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، لاپەڕە(٢١).

ئیحسان رەشاد موفتی، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر - مێژووی کۆن، مێژووی ئیسلام، مێژووی نوێ) لاپەڕە (١٣٣٢).

تارق جامباز، (ناودارانی دەفەری سۆران - شێخ کاکەمینی سەران ١٨٧٤ - ١٩٤٠)،لەلاپەڕە(٣١).

حەسەن مستەفا ئەحمەد توتمەیی، چاوپێکەوتن لە ساڵی ١٩٨٤ لە گوندی توتمە.

خالید حەمەدەمین مستەفا هەرمکی، چاوپێکەوتن لە ٢٠١٢/٦/١٥ لە گوندی مێرگەسەر.

مەلا ڕسول حەمەد وەرتی، چاوپێکەوتن لە ٢٠١٩/٩/٢٥ لە گوندی وەرتێ.

محەمەد عەبدوڵا خدر سەرسیانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠٢٠/١/١٢ لە شارۆچکەی سەروچاوە.

## دووەم: لێکترازانی کۆمەڵایەتی

چەند ڕوداوو بارودۆخێك هەن، کە وا لە خێزانەکان دەکەن، پەرش و بڵاو و پەرتەوازە بن، یەکێك لەو ڕوداو و بارودۆخانە، نەبوونی خۆراك و برسیەتییە، کە بە هۆیەوە ئازیزترین و خۆشەویسترین مرۆڤەکان لە یەکتری دادەبڕێن و وێڵ دەبن بە دوای بە دەستهێنانی ژەمەخواردنێك، کە ڕەنگە جارێکیتر یەکتری نەبیننەوە!.

**پەیسەر پرێس:** (لە گرانییە گەورەکەدا،کە لەنێوان وەرزی پایز و زستانی (١٩١٤) دابوو، برسیەتییەکی زۆر ڕووی لە خەڵکی کوردستان کرد،پیاوێکی خەڵکی دێیەکەمان هاتە لای باوکم و گوتی: هیچ خواردنێکمان نەماوە،تکایە هەردوو کچەکەم لە کوڕەکانت مارە بکە،با لە برسان نەمرن! بەڵام باوکم داواکاریەکەی ڕەتکردەوە،دوای ماوەیەکی کەم هەردوو کچەکەی لە برسان مردن. ئەمە یەکێکە لە هەزاران ئەو چیرۆکانەی کە لە ئانوساتی جەنگی جیهانی یەکەمدا ڕوویانداوە،خۆ ئەگەر ڕووپەڕی کتێبەکان و یادداشتی کەسە بەتەمەنەکان هەڵبدەینەوە،دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە جەنگ و برسیەتی چیرۆکی تراژیدی وای هێناوەتە ئاراوە کە مرۆڤ لە ئاستیاندا چۆك دادات و هەناسەی لە سینەیدا ڕادەوەستێت و چاوەکانی ئەبڵەق بن) .

گەر ئەو هەزاران چیرۆکەمان لە سەر زاری خەڵك وەرگرتبان و تۆمارمان کردبان، هەرچەندە کارێکی زۆر ئەستەمە، ئەم پەڕتوکە چەند بەرگێکی لە خۆ دەگرت.

**تاهیر احمد حەویزی:** (کابرایەك پێنج کچی هەبوو ،هەمووی بە نیو کۆتك جۆ دان! زۆر ئافرەت بە چۆرێك ئاوی سەروپێ،خۆی لە پیاوێك مارە دەکرد ،ئافرەت زۆر بوون وە نێرینە کەم بوون) .

**عومەر ئەحمەد زێغانی:** (لە خۆشناوەتیدا، دایك و باوکی وا هەبوون، لە برسان مناڵەکانیان فڕێداون) !.

ئەو ڕوداوە کۆڕەوەکەی ساڵی (١٩٩١) ی باشوری کوردستانمان بیردەخاتەوە، ئەو کاتیش دایك و باوکی واهەبوو، مناڵەکانیان لە ڕێگادا فڕێ دەدان .

**عەبدوڵڵا قادر بێناتانی:** (ئەوانەی لە گوندی بێناتان بەزیندویی مابوونەوە ،پەراگەندەی شوێنەکانی تر بوون و گوندەکە چۆڵ بووە و بووەتە کاولگە) !.

**ئیبراهیم ئیبراهیم میاوەلی:** (لە باسی ناوچەی پشدەر نوسیویەتی: (لە گوندی کەڵەکان، کابرایەکی خواناس و بە دین و موسڵمان هەبووە، بەناوی (ئالا)، سۆفی دەبێت، دەوڵەمەند و خوداپێداو دەبێت، وا ڕێکدەکەوێت ئەو ساڵە هاوسەرەکەی کۆچی دوایی دەکات، ژنێکیش بەناوی (فاتیمە موهاجیر)، لە کەڵەکان پەیدا دەبێت، لە ژیان دەگەڕێت، فاتیمە موهاجیر ماوەیەك بە نانە سکی، ئیش و کار بۆ مام (ئالا) دەکات، ڕۆژێکیان فاتیمە موهاجیر دەڵێت: بۆ مارەم ناکەیت یەکجاری و کەسم نییە.. مام ئالاش لەبەر ئەوەی لێی قەوماوە، زۆری پێ باش دەبێت، فاتیمە موهاجیر مێردەکەی دەبینێتەوە و دەڵێت شتێکی وا هەیە، دەڵێت چی؟ تۆیش و مناڵەکانیش بە خێو دەکەم و دەژێنم، بەلاّم خۆتان ئاشکرا مەکەن، مێردەکەیشی لەبەر بێ چارەییان زۆری پێ باش دەبێت. ژنە مێرد بە مام ئاڵڵا

دەکات و دەچێتە سەر ماڵ بەیەکجاری، ژنە بە دزیەوە دوو منداڵەکەیی و مێردەکەی بە خێو دەکات، هەتا هەرزانی پەیدا دەبێت،کاتێك هەرزانی پەیدا دەبێت، (فاتیمە موهاجیر) بە مام ئاڵڵا دەڵێت: من مێردم هەیەو لە برسا مەجبوری مێردم بە تۆ کردووە... مام ئاڵڵاش دەست بە گریان دەکات و دەڵێت: ئای ماڵی دونیا.. قیامەتیشم لە دەست چوو، مام ئاڵڵا دەچێتە گوندی گەرمکان بۆ خزمەت مەلا حەمەدی دەرگەیی گەورەو کارەساتی بۆ دەگێڕێتەوە، مامۆستاش دەفەرموێت: هیچ لایەکتان تاوانبار نین، لەبەر ئەوەی ڕۆژگار ژنەکەی زەروری ئەم حاڵە کردووە و پیاوەکەیشی بێ خەبەرە، واتا مام ئاڵڵا. ئێستا لە ناوچەی پشدەر خەڵکێکی زۆر لە ژن و پیاو هەن، کە ئێستا لە ژیاندا ماون لە ژن و پیاو، کە پیاوەکە ژنی هێناوەو ژنەکەیشی شوی کردووە و منداڵ و نەوەیان هەن) .

پەڕتوکی (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی میراودەلی پشدەر) نوسینی (ئیبراهیم ئیبراهیم میراودەلی) لە ساڵی (٢٠٠٣) چاپکراوە، ئەوکات خەڵکانێك لە ژیاندا مابوون کە خۆیان لە نێو ڕووداوەکاندا بوون . دەتوانین نمونەی زۆر بهێنینەوە لەسەر چەندین ژن و کچی لێقەوماوو برسی کە لەلایەن کوڕو پیاوی تا ئاستێك گوزەران باش مارەکراون) .

**حوسێن مستەفا سوری:** نەنکم ناوی (عائیشە) بوو، دەیگێڕایەوە: (ئەوانەی لە خۆشناوەتیدا زۆر هەژار بوون، دەربەدەری گوند و ناوچەکانی دەوروبەر بوون، بەڵام خاوەن ئاژەڵەکان لە گوندەکاندا مانەوە، گرانییەکە زۆر کاری لێ نەکردن) .

**یوسف محەمەد کانی بەردی و حەسەن حوسێن کانی بەردی:** پیاوێکی بەتەمەنی گوندەکەمان بە ناوی (حوسێن) دەیگێڕایەوە: (خێزانی وا هەبوو، کچی تازە پێگەیشتووی، بە یەك تەنەکە گەنم بە شوو دەدا!) .

لەوپەڕی ناچاریدا بووە، باوکەکە بەشودانی کچەکەی بەو شێوەیە توانیویەتی، یەکەمیان: بەو تەنەکە گەنمە، بۆ ماوەیەك خێزانەکەی بژێنێت، دووەمیان: کچەکەی داوەتە خێزانێك کە باری ئابوورییان باش بووە، سێیەمیان: ئەرکی بەخێوکردنی کچەکەی لە سەر شان نەماوە.

**نەجمەدین ڕەسوڵ بێڕۆیی:** گوێم لە باوکم بوو دەیگێڕایەوە: (حەوت ژن کە خەڵکی ڕۆژهەلاتی کوردستان بوون، لە ناو برسیەتی ئاوابیەکەی خۆیان جێ هێشتبوو و بە ڕێککەوت هاتبوونە گوندی بێڕۆ، ئەوان هەموویان گەنج بوون، (کوێخا محمەد ) کە کوێخای گوندەکەمان بوو، ویستی یەکێکیان مارە بکات، کەچی هەر حەوتیان دەیانویست شوو بە کوێخا بکەن! کێشە لەنێوان ژنەکاندا ڕوویدا، بۆیە کوێخا تووڕە بوو، هیچیانی مارە نەکرد، دواتر لە گوندەکە ڕۆیشتن، ژنەکان بەنەتەوە (کورد ) بوون، (فارس) یشیان تیادابوو) .

دەکرێت ژنەکان هەر یەکێك ئەندامی خێزانێك بووبن و برسیەتی خێزانەکانیان پەرت و بلاو کردبێت، لێرەدا ئەوەی سەرنجمان ڕادەکێشێت ئەوەیە: بۆچی هەموویان ویستوویانە شوو بە کوێخا بکەن ؟ ئایا لە گوندەکەدا هیچ کوڕ یان پیاوێکی تری گەنجی بارو گوزەران باشی تیادا نەبووە ؟ یان هەر کوێخا توانیویەتی بژێوی ژیانیان دابین بکات ؟!.

**عوسمان حەسەن گۆڕەشێری:** نەنکم دەیگێڕایەوە: (دوای خواردنی گوڵە جۆکان،بەمنداڵەکانم گوت: ئێوە بڕۆن ، منیش وردە وردە لە دواتان دێم، ئاوان ڕۆیشتن و منیش کوڕە ساواکەم لەو شوێنە چۆڵ و بێ هاوارە بەجێ هێشت ! بەدوای ئەوانی تردا ڕۆیشتم و لەسەرچاوەی ئاوی مەلەکان پێیان گەیشتمەوە، منداڵەکانم کاتێك منیان بینی و براکەیانم پێ نەبوو،پێیان گوتم: دایکە براکەمان چی بەسەرهات ؟ پێم گوتن: داومەتە پیاوێك بەخێوی بکات و کە گەورە بوو بماندا‌تەوە، منداڵەکان ڕازی نەبوون ، بەناچاری بەدوای منداڵە فڕێدراوەکەمدا گەڕامەوە ، ئەو هەر لەو شوێنە بوو کە لێم جێ هێشتبوو ، زۆر گریابوو ، لە باوەشم کرد و بەرەو گوندەکەمان گەڕاینەوە) .

کار بگاتە ئەو ئاستەی، دایك جگەرگۆشەکەی فڕێ بدات و لێی دیار نەبێت چارەنووس بۆ کوێی دەبات، ئایا لەو شاخە چۆڵ و بێ هاوارە، گورگ و ئاژەڵە دڕندەکانی تر، بە زیندوویی دەیخۆن ؟ یان لە برسان دەمرێت و... هیتر .

**خالید حوسێن:** (لە گەڵ بەتاڵانبردنی ئازوقەو مەڕومالاَت،ئەو کات خەڵکێکی زۆر ناچاربوون،ناوچەکانی خۆیان بەجێبهێڵن و ڕوو لە ناوچەکانی تر بکەن،بە مەبەستی گەڕان بە دوای سەرچاوەی ژیان،بەمەش گۆڕینێکی بەرچاوی دیمۆگرافی و دابڕانێکی کۆمەڵایەتی ڕویداوە،کەتا ئێستاش زۆر خێزان نەیانتوانیوە،کەس و کاری خۆیان بدۆزنەوە) .

## پەراوێز:

ئیبراهیم ئیبراهیم میاودەلی، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی میاودەلی پشدەر)، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٤٠).

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان...)، گۆگڵ، لە ژمارەی ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١.

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم،لاپەڕە(١٣٣)، لەباسی شاری کۆیە.

حوسێن مستەفا سوڕی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٧/١٢/١٤ لە کۆمەڵگای شکارتە.

حەسەن حوسێن کانی بەردی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٢١ لە گوندی کانی بەرد.

خالید حوسێن، (سەفەربەلك یان سەفەر بەرلك)، لە فەیس بوك، لەلاپەڕەی تایبەتی خۆی لە(١٤)ی نوفمبری(٢٠١٨).

عەبدوڵلا قادر بێناتانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٨ لە گوندی بێناتان.

عومەر ئەحمەد زیخانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/١ لە گوندی زیخان.

عوسمان حەسەن گوڕەشێری، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/١٠/١٩ شاری ڕانیە.

نەجمەدین ڕەسوڵ بێڕێیی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٢٥ لە گوندی بێڕێ.

یوسف محەمەد کانی بەردی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٢١ لە گوندی کانی بەرد.

## سێهەم: ئاوارەبوون و گەڕان بە دوای خواردندا

مرۆڤ لە کاتی برسیەتیدا، بۆ بەدەستهێنانی خواردن، ناچاردەبێت لە دەرگای هەموو ماڵێك بدات، بۆ ئەوەی لە برسان نەمرێت و لە ژیاندا بمێنێتەوە، هەر خواردنێك دەستی بکەوێت، تەنانەت ئەگەر لە کاتی ئاساییدا، شیاوی خواردنیش نەبێت، لە کاتی برسیەتیدا شیاوی خواردنی دەکات. هەروەك پێشینان گوتوویانە: (برسیەتی ڕێیەکە لە هاری. برسی لە چ ناپرسی. مرۆڤی برسی بیر لە هیچ شتێکی تر ناکاتەوە، جگە لە پەیدا کردنی خواردن).

**تارق جامباز:** (خواردنیش ماش و نیسك و ساوار و گەنمەکوتاو ئەو شتانە بوون، کە بە خۆمان دروستمان دەکردن، یان دەمانچاندن، وە لە ساڵی گرانیدا، هەموو کەسیش بە ئاسانی ئەم خواردنانەی بە دەست نەدەکەوت) .

**محەمەد حەسەن سەرگەینێڵی:** (بێگومان شەڕی ڕووس و ئێران،جگە لە کوشتار و کوشتن ،چەندان کارەساتی تری کوشندەی بە دوای خۆیدا هێنا، لەوانە: ئاوارەبوون،کاتێ کۆڕەوی کوردە ئێرانییەکان گەیشتە ناوچەی پشدەر، حەشاماتەکە ئەوەندە زۆر بووە، لە حەوزی پشدەر نەدەحاوانەوە، ناچاربوون بەرە و بیتوێن و کۆیە و سلێمانی و دەشتی هەولێر بڕۆن. ئەو ئاوارانەی لە حەوزی پشدەر مانەوە ،حاڵیان زۆر زۆر خراپ بوو، ئەوانەی کە زێڕ و پارەو کەل و پەلیان پێ

بوو، ماوەیەك باش بوون، بەلاّم ئەوانەی کە هیچیان پێ نەبوو،حاڵیان زۆر خراپ بوو، لە سەر حیسابی خەڵکی ناوچەکە دەژیان) .

لە باسی پێشڕەوی کردنی سوپای ڕووس، بۆ ڕۆژهەلاّتی کوردستان و ئاوارە بوونی خەڵکەکەی بەرە و باشووری کوردستان، زانیاری زیاترمان لەبەردەستدایە کە لێرەدا تۆماری بکەین، با گوێ بۆ ڕوداوەکانی تر بگرین:

**ئیبراهیم ئیبراهیم میاوەلی:** (خەڵکی کوردستانی ئێران، لە ترسی ئەم شالاّوە تاریك و دڕندانەیە، دەستیان کرد بە کۆچڕەوو ئاوارە بوون بۆ کوردستانی عێراق، ئەو کۆچ و ڕەوە قاتوقڕی و هەژارییەکی زۆر سەختی خستە کوردستانی عێراق، پیر و کۆنە ساڵەکانمان دەگێڕنەوە: لە وەرزی پایزی هەمان ساڵ، تا وەرزی بەهار بەردەوام بوو. لە هەمان کاتدا هێرش و پەلاماری کۆچکردووان و ئاوارەکان، گەیشتە ڕادەیەك، بەربەستکردنیان زەحمەت بوو، دەبوایە هەموو ماڵێك لە ترسی ئەم کۆچکردوانە، دەرگای لە سەرخۆی دابخستایە، دەڵێن زۆر جار هەبووە، بە دوو سێ نەفەر، بە کووتەك و لێدان لە کۆڵ ماڵێکیان کردوونەتەوە، واش لە برساندا نەدەگەڕانەوە. دەگێڕنەوە ئاوارە و کۆچکەرەکان هێندە زۆر بوون، لە سنووری گوندەکانی ئاسۆس، خەڵکەکە بە زۆری و بە کوتەك و دار لێدان، کردویانەتە ئەوبەری چەمەکە، دیسان ئەوانیش کردویانەتەوە ئەو بەری چەمەکە و لەم بەرو ئەو بەرەدا، دەستیان دەگرت بۆ پەڕینەوە، لەبەر ئەوەی هێندە بێ هێز بوو بوون، زۆربەی زۆریان ئاو دەیبردن و دەخنکان) .

ڕووداوەکان هێندە ناخهەژێنن، بە خوێندنەوەیان وەك ئەوە وایە سەیری فیلمێك بکەین کە پڕیەتی لە دەردەسەری و ماڵوێرانی .

**یووسف محەمەد کانی بەردی و حەسەن حوسێن کانی بەردی:** لە کاتی گرانیەکەدا ،گوندی کانی بەردی خۆشناوەتی نزیکەی بیست ماڵ بووە، گوێمان لەپیاوێکی بەتەمەنی گوندەکەمان بوو بە ناوی (حەمەد مستەفا) کە دەیگێڕایەوە: (زۆربەی شەوان، خەڵکی برسی لە کۆڵانەکانی گوندەکە، ماڵ بە ماڵ بۆ بەدەست هێنانی خواردن دەگەڕان، ئێمەی خەڵکی گوند هەر لە ئێوارانەوە، دەرگاکانمان گارە دەدان، برسیەکان پەنجەیان لە کونی دۆریخەی دەرگاکان ڕادەکرد ، بۆ ئەوەی دەرگایان لێ بکەینەوە و نانیان بدەینێ، بەلاَم کەس توانای ئەوەی نەبوو نانیان بداتێ و کەس دەرگای لێ نەدەکردنەوە) .

خەڵکی ئەو گوندە زووربەیان خاوەن ئاژەڵ بوون و کەمتر دوچاری برسیەتی بوون، برسیەکان زوربەیان خەڵکی شوێنەکانی تر بوون، کە هاتوونەتە گوندەکە .

**پەیسەر پرێس:** (لەو ساڵەدا ژمارەیەکی زۆر لە کوردو ئەرمەنیەکانی ڕۆژهەلاَتی باکوری کوردستان‌بەرەو باشوری کوردستان(ویلایەتی موسڵ)بۆ دەربازکردنی گیانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان کۆچیانکرد،زۆرینەی ئەوانە تەنها خۆیان دەرچووبوون و هیچ پێداویستیەکیان لە گەڵ خۆیان نەهێنابوو،هەر بۆیە بوونە بارێکی گران بەسەر ئەو بەشەی کوردستانەوە،کە ژمارەیان زیاتر بووە لە(٧٠)هەزار کەس،مێژوونوسان دەگێڕنەوە: لە سەرجەم گوند و شارەکانی ئەو

ویلایەتەدا،خەڵکی هەژار و داماوی ئاوارە بلاّو بووبوونەوە،بە هۆی برسیەتی و قاتوقڕیەوە،کەوتبوونە ڕێگری و دزینی ئەو شتومەکانەی کە خواردن بوون) .

**مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی:** (لەساڵی (١٩١٦) لەسەردەستی سەربازەکانی ڕووسیای تزاری، خەڵکی ڕواندز بەشی هەرە زۆری دەربەدەری شاران بوون و هەندێکیان لە برسان مردن و زۆر خەڵکیش نەگەڕایەوە ڕواندز و کەسی لێ نەما).

**عوسمان حەسەن گۆڕەشێری:** لە نەنکیەوە بیستویەتی کە بەو شێوەیە گێڕاویەتیەوە: (لە گوندی گۆڕەشێر، لە دۆڵی مەلەکانەوە لە گەڵ چەند منداڵێکم بۆ بە دەستهێنانی خواردن چووینە گوندی شێەی سەروو لە دۆڵی بالیسان، تەنها چەند گوڵە جۆیەکمان دەستکەوت، لە کاتی گەڕانەوەدا لە سەر شاخی دەرە شێر خواردمان).

**هێمن عومەر:** (بەهاری ساڵی گرانی هەزار و سێ سەد و سی و شەش (١٣٣٦هـ - ١٩١٨م)، بەهارێ بوو خوڕەم و دڵگوشاد، بەهارێ وا کە لە کۆیێ مەشهورە،بەهاری وا خۆش کەم بووە! کەس تەماشای باغ و داغ و کێوو کەژ و سەر و سەمەن و یاسەمەن و عەر عەر و شمشاد و گوڵ و ڕەیحان بنەفشە و لال و عەباس و سونبول و نێرگز و خاوو گیابەندی نەدەکرد!! وەك شانە مێروو بەرێ (هەیبەسوڵتان) و (چنارۆك) و (میرسەید) دا دەچوونە ئەو دیو بۆ کەنگر، گوڵە کەنگرێ لە نەزەری پاك و پیس، هەزار دەستە گوڵی دەهێنا! چاوەزاری چی برام بابم؟! گەلێ جار ئەموت لەمەولا، لەباتی وردە پەرچەم و زولفی بەلول، کوڵمەی ئاڵ و گەردنی زەردی بە وردە خاڵ، حەیرانان بە کەنگرێ هەڵبڵێن، چاکە! لە

وەقتی گرانی کێ بە کێ هەڵنەکاڵێ؟. لە کۆمێنتێکدا، (محەمەد جەلی زادە) بۆی نووسیوە: هەروەها مەلای گەورە لە مەجلیسی خۆیدا، گوتوویەتی: (ئەگەر کورد ئالآی هەبێت، دەبێ نەخشی کەنگری لە سەردابنێین، چونکە لە سالآنی گرانیدا هەمیشە، کەنگر بە هانای هەزاران خەڵکی برسی هاتووە و لە مەرگ ڕزگاری کردوون) .

ئەوەی سەرەوە بیرەوەریەکانی (مەلای گەورەی کۆیە)، وادیارە لە بەهاری ساڵی (١٩١٨) لە کۆیە بارانی زۆر باریوە .

**مستەفا عبدالقادر بالیسانی:** ڕووداوێکی تری لە سەر زاری (حاجی حسین)، کە پیاوێکی بەتەمەنی گوندی بالیسانی خۆشناوەتی بووە، بەو شێوەیە گێڕایەوە: (لە گوندی بالیسان شەوێك دوای مەلا بانگدان، پیاوێك لە جلوبەرگدا پێ دەچوو (مەلا) بێت، لە دەرگاکەمانیدا، منیش دەرگاکەم کردەوە،پیاوەکە پاڕایەوە و پێی گوتم: مردم لە برسان دەخیلتان بم لەتکە نانێکم بدەنێ! منیش داواکەیم ناراستەی دیکم کردوو و پێم گوت: دایکە مەلایەك هاتووە زۆری برسی یە، ئەویش گوتی: (ڕۆڵە هەندێ خواردنی بدەرێ، مەلا لە بەر دەرگاکە چاوەڕێی دەکردم، منیش سینیە خواردنێکم بۆ هێنا، نازانم نیسك بوو یان ماش، مەلا شاقەلی کەواکەی گرتەوە و خواردنەکەم ڕۆکردە ناوێ، لەو کاتەدا نزیکەی (٢٠) کەسی برسی بەرە و ماڵی ئێمە غاریاندا، منیش ترسام و دەرگاکەم داخست، لە پەنجەرەکەوە سەیرم دەکردن، برسییەکان گەیشتنە لای مەلا و دەیانویست بەشێك لەو خواردنە بخۆن، کە لەنێو شاقەلی مەلا دابوو، مەلایان لە ناو خۆدا گرت و

کەوتە ژێر دەست و پێیان! ڕوان ڕوانێك بوو، مەلا خۆی ڕادەپرچکاند ، بەس بۆ ئەوەی خۆی دەربازبکات، وازی لە خواردنەکە هێنا بوو، لە نێو گردۆزەکەدا هەندێکیان دەستیان گەیشتە خواردنەکە و کەمێکیان لێ خوارد، هەرکەس هەولّی دەدا مەلا بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، بۆ ئەوەی ئەو خواردنەی بە شاقەلّی کەواکەیەوە مابوو دەستیان بگاتێ و بیخۆن، مەلا دیار نەما لە نێو ئەو هەموو خەلّکە برسی و ڕووتە، دواتر لە بن دەست و پێیاندا خنکا. بیرەوەریەکی تر: دوو برا زۆر دەولّەمەند بوون، شەو تا بەیانی لە دیووی ژوریّ، بە نۆرە نۆبەتداریان دەکرد، نەوەك برسیەکان دەرگاکەیان بشکێنن و بچنە ژوریّ و دەست بە سەر خواردنەکەیاندا بگرن و بیخۆن! ئەوکات برسیەکان مالّ بە مالّ دەگەڕان و دەرگاکانیان دەشکاندن) .

**مداود ابراهیم:** پیاوێکی قسەخۆشی لای خۆمان کە ئێستا نەماوە، گێڕایەوە و وتی: (تەمەنم (٦) بۆ (٧) سالاّن بوو، هیچ گەنم و دانەوێلّەیەکمان نەبوو بۆ نان و خواردن، باوکم چەند ڕۆژ بوو ڕۆیشتبوو بۆ پەیداکردنی گەنم یان جۆ، منیش شەو و ڕۆژ دەگریام و بانگی دایکم دەکرد دایە برسیمە (توخوا نان)، دایکم هەرچۆنێك بیّ بە قسەو گژوگیا و چەند دنکە دۆینەیەك دەیخافلاّندم... باوکیشم لەمێژ بوو ڕۆیشتبوو، بە خۆیی و کەرەکەیەوە، ئێوارەیەك نزیکی مەغریب بوو، باوکم بە سواری کەرەکەوە خۆی کرد بەمالاّ، دابەزی و بنە گونیەیەك ئاردی داگرت و بە دایکمی گوت بە خوا یەك تەنەکە گەنم و جۆم بە تێکەلّی دەستکەوتووە و یەکجارەکی لە ئاشەکەی خوار مالاّن کردومە بە ئارد، ئادەی

ئافرەت خێرا ساج و ئاگر ئامادە بکەو هەندێك کولێرە دروست بکە، دایکم بە ڕحمەت بێ خێرا قۆڵی لێ هەڵکرد و دەستی کرد بە کولێرە کردن، دایکم حەوت (خەپلە) ی لە سەر یەك گەرم کرد و من خواردم! دڵیشی نەهات بڵێ کوڕم بەسە، چونکە تەنها منیان هەبوو، هەتا حەوت خەپلەکەم خوارد، باوکیشم لەولا دانیشتبوو بە سەر سوڕمانەوە! سەیری منی دەکرد، لە دوای حەوت کولێرە خواردن، ئیتر دایکم گەیشتە تینی و ووتی: بەسە کوڕم با ئێوارە باوکیشت دوو خەپلە بخوات، گوناحە هیلاکە، منیش بە قایم قیژاندم بە سەر دایکماو ووتم: بەخوا ئێوارەش نانتان لە گەڵ ئەخۆم...خۆ تێرم نەخواردووە...!! ئیتر باوکم هەڵسایە سەرپێ و بە هەردوو دەست کێشای بە سەری خۆیدا و ووتی: دەك قوڕ بە سەرم بە خوا حیسابمان ڕۆیی.....!!!) .

**حەسەن سەعید بەگ خەلیفەیی:** گوێم لە ژنێکی بەتەمەنی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو لە گوندی باسەرێ بناری کۆسرەت بەناوی(سێوە) ئەو بەو شێوەیە بۆی گێڕامەوە: (لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایك بووم و ماوەیەك لەوێ ژیاوم، لەوێ لە کاتی گرانیەکەدا برسیەتی تینی بۆ هێناین ناچار بووین بە دوای خواردندا بگەڕێین، خەڵکێکی زۆر لە تاو برسیەتی بەرەو ناوچەی پشدەر لەوێوە بەرەو دەربەندی ڕانیە و بیتوێن و خەڵەکان کەوتینە ڕێ) .

خەڵکی ئەو شوێنانەی کە ئەوان هانایان بۆ بەر بردوون، بەشێکی زۆریان لەو کاتەدا لەتاو برسیەتی ناڵاندوویانە .

**عوسمان حەسەن گۆڕەشێری:** نەنکم دەیگێڕایەوە: (هیچ خواردنمان نەمابوو ، کات کۆتایی وەرزی بەهار بوو، لە گەڵ منداڵەکانم چووینە گوندی شیەی سەروو ، بە مەبەستی خواردنی (تو) ، کە تازە پێگەیشتبوون ، کاتێ گەیشتینە گوندەکە ، خەڵکی گوند پێیان گوتین: تووەکانمان پاوان کردون ، بڕۆن لێرە ! بەناچاری گەڕاینەوە ، دوو کوڕ و کچێکم لەگەڵ بوون ، کوڕێکم لەنێو پاشۆل، لە پشتێ هەڵدابوو، ئەوانیتر لەگەڵ من ڕایان دەکرد ، کاتێ گەیشتینە دەرەشیر لە بناری شاخ ،پارچە (جۆ) یەك لە سەروبەری کامڵ بوندابوو ، چەند گوڵە جۆیەکمان کرد و لە شاخەکە سەرکەوتین بەرە و گوندی مەلەکان ، لەوێ ئەو گوڵە جۆیانەی هێنابوومان، لەسەر بەردێکی تەخت ڕامانکردن و بەبەردێك کوتامان و دانەکەمان خوارد) .

لێرەدا وادەردەکەوێت بەهاتنی وەرزی بەهار، هەرچەندە لامان ڕوون نییە لە کامە ساڵدا بووە، سروشت دەرگای سۆز و بەزەیی بەڕووی خەڵکی هەژار و برسیدا کردووەتەوە، ئێمە وای بۆ دەچین بەهاری ساڵی (١٩١٨) بووبێت، پشت بەست و بە بیرەوەریەکانی (مەلای گەورەی کۆیی)، کەلە پێشدا باسمان کردووە . دووری نێوان گوندی گۆڕەشێر و شیە، نزیکەی (١٥) کیلۆمەتر دەبێت، لەوێڕا بەو دۆڵ و شاخە سەخت و هەوراز و نشێوەدا، بۆ خواردنی میوەیەکی بەهاری هاتوونەتە گوندی شیە، دیارە لەو کاتدا لە گوندی گۆڕەشێر توو پێنەگەیشتوون. گوندی گۆڕەشێر دەکەوێتە دۆڵی مەلەکان و لە گوندی شیە ساردتر و کوێستان ترە، کە دەکەوێتە دۆڵی بالیسان .

**زوبێر ڕەسوول علی:** (گەر سەرنجی دانیشتوانی باڵەکایەتی بدەین و لە ڕەگ و ڕیشەیان بکۆڵینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە دانیشتوانی دەڤەرەکە بە گشتی هەر گوندە و لە ناوچەیەکی تری کوردستان،کۆچی کردووە بۆ دەڤەرەکە.چۆڵی ناوچەکە دوای گرانیی گەورە،هاندەر بووە بۆ نیشتەجێ بوون و مانەوە،گەر سەرنج بدەین، دانیشتوانی زۆرێك لە گوندەکان لە ئێرانەوە کۆچیان کردووە وەك: (ناوبەرگە و شێخوەتمان و کەوەرتە و ئێنە و....هیتر) وە بەشێکی تریش لە باشووری دەڤەرەکەوە هاتوون،بۆ نموونە: زۆرێك لە دانیشتوانی (ناوەندە) ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە سەر عەشیرەتی (خۆشناو)، وە بەشێکی (دێڵزە و دەربەند)، دەگەڕێنەوە سەر سورچییەکان...هەموو گوندەکانی تریش بەو شێوەیەن، ئەو باسە پێویستی بە توێژینەوەیەکی گەورە هەیە.....) .

لێرەدا سەرنجمان بۆ ئەوە دەچێت، خەڵکی ناوچەی باڵەکایەتی لە سەردەمی گرانیەکەدا، لە دەڤەرەکەدا لە برسان مردوون، یان پەڕاگەندەی دەوروبەر بوون و بەدوای بە دەستهێنانی خواردندا گەڕاون .

**جەرجیس فەتحولا:** (دوای کۆتایی هاتنی شەڕ و لە پاش چوار ساڵ لە توندو تیژی و وێرانی، بە هەزاران کوردمان بینی کە بەرەو ورمێ ڕەویان دەکرد و دەگەڕان بە دوای نان و ماڵدا، حاڵیان ئەوەندە خراپ بوو دڵڕەقترین کەسی دەهێنایە گریان). پێدەچێت تا ماوەیەك دوای شەڕ، لە چەند شارو دەڤەرێکدا، گرانی و برسیەتی هەر بەردەوام بووبێت، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کە دەستی هاوکاری ئینگلیزیان

پێ نەگەیشتووە، چونکە ئاسایی بوونەوەی دۆخەکە هەروا بە ئاسانی نەگەڕاوەتەوە دۆخی پێش جەنگ .

**هاوکار عبدالله شێخ وەسانی:** (ئینسانێ ئینسان بێ، بەد ئەصڵ و بەد نیهاد نەبێ، ئەیامی فەقرٍ و فاقە و زیللەت و مەسکەنەتی، لە فکر ناچێ، تاکو لە حیفزی حاڵ و ئیستیقبال غافڵ نەبێ، لە (قەحت) و غەلای سەنەی (١٣٣٦) هیجری، گەلێ کەس سواڵیان ئەکرد، لەبەر دەرکان ئەخولانەوە، گوێچکە نانێکیان دابانێ، هەزار دوعایان ئەکرد، بە سەد حاڵ تا قورتاربوون، دوایی دیتنمانەوە، ئەو ڕابردوانەیان لە فکر نەمابوو، دەعیە و فیزێکی تر، شیوی ساواریان نەئەخوارد، کەی ئەو پیاوانە سواڵیان کردووە، بۆ چنگە نانێ گەڕاون؟ ئومەمی ئیسلامییە خاصەتەن قەومی (کورد)، لەبەر بێ تەزەکوری (ماچی)، لە سەعادەتی ئیستیقبال، مەحرٍوم بوون) .

ئەوەی (هاوکار عەبدولا) لە سەرەوە نوسیویەتی، بیرەوەری (مەلای گەورەی کۆیێ) یە، ئەو لەو ڕۆژگارەدا ژیاوە، بۆ خۆی بارودۆخ و ڕووداوەکانی بینیون، بەراوردێك لە نێوان بارو گوزەران و ...هیتر، ئەوسای خەڵکی کۆیە و دوای گرانیەکە دەکات.

## پەراوێز:

ئیبراهیم ئیبراهیم میاوەلی، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی میاوەلی پشدەر)، بەرگی یەکەم، لاپەڕەکانی (١٣٦ ـ ١٣٨).

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان....)، گۆگڵ، ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١.

تارق جامباز، (ناودارانی دەفەری سۆران ـ شێخ کاکەمینی سەران ١٨٧٤ ـ ١٩٤٠)،لاپەڕە(٣٤).

جەرجیس فەتحولا، (وریابوونەوەی کورد ـ مێژووی سیاسی ١٩٠٠ ـ ١٩٢٥)، بەشی یەکەم لاپەڕەکانی (١٠٢ و ١٠٣).

حەسەن سەعید کەریم خەلیفەیی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/٤/١٤ لە کۆمەڵگای شکارتە.

**حەسەن حوسێن کالی بەردی**، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٢١ لە گوندی کانی بەرد.

زوبێر رەسول علی، (گرانی گەورە و هۆلۆکۆستی ئێرانیەکان)، بەشی دووەم لە فەیسبوك، لاپەڕەی تایبەتی خۆی، لە باسی باڵەکایەتیدا.

**عوسمان حەسەن گۆزەشێری**، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/١٠/١٩ لە شاری ڕانیە.

م.داود ابراهیم، (گرانی گەورە) لە فەیسبوك، لاپەڕەی تایبەتی خۆی، لە (٧) ی اکتوبری (٢٠١٨).

م.محەمەد حەسەن سەرگەینێلی، (هۆزی ئاکۆ لە نێوان مێژووی کۆن و نوێدا)، لاپەڕەکانی (٣٩٨ و ٣٩٩).

مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی، (ڕواندز بباڵەك برادۆست)،لاپەڕە(٢٦).

**مستەفا عبدالقادر بالیسانی**، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٤/٢٧ لە گوندی بالیسان.

هێمن عومەر، (بەهاری ساڵی گرانی!)، فەیسبوك، لە پەڕەی تایبەتی خۆی لە ٢١ مارسی ٢٠١٦.

هاوکار عبدالله شێخ وەسانی، (دین و جیهانبینیی مەلای گەورە)، کتێبی ـ ١ ـ لاپەڕە (١٧٤) .

**یوسف محەمەد کالی بەردی**، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٢١ لە گوندی کانی بەرد.

## چوارەم: هاوکاریی هەژار و لێقەوماوان

لە هەموو سەردەمێکدا، مرۆڤانێك هەبوون کە باری ئابوورییان لە خەڵکی دەوروبەر باشتر بووە، بەڵام مەرج نی یە، هەموو ئەوانە کەسانی دڵکراوە و مرۆڤ دۆست بووبن، ئەوانەی لە کاتی قات و قڕی و برسیەتیدا، هاوکاری خەڵکی هەژار و لێقەوماویان کردووە، ڕەزامەندی خەڵك و پەروەردگاریان بە دەستهێناوە و ناویان لە لاپەڕەکانی مێژوودا بە وشەی زێڕین و شکۆداری ماوەتەوە و دەمێنێتەوە و خەڵکی کوردستان شانازیان پێوە دەکات .

**تاهیر احمد حەوێزی:** (حەمەدەمین بەگ کوڕی حاجی عەولاّ بەگ، بۆی گێڕامەوە: لە گرانیەکەدا گەنمێکی زۆرمان هەبوو، ژنەکان هەموو ڕۆژێك نانیان دەکرد، هەتا سبەینێ هیچ نەدەما، بە بابمیان گوت: ئێمە بە نان کردنێ بە هیلاك چووین، لەبۆ خۆت نان کەرێك ڕابگرە، نانیان دەکرد، کەبەشی فەقیریان دادەنا، بابم یەك دووەکی دەخستنە بن چۆکی دەیشاردنەوە. جارێکیان کابرایەك بە عەباوە بەبەردەرکەماندا هات، باش نی یە ناوان بڵێین، برسی بوو، بۆنی نانی کرد بوو، هەر دەچووە خوارێ و دەگەڕاوە، بابم دیتی گووتی: ئەوە برسی یەتی، دەی خێرا نانەکی لەبۆ ببەن، کەنانەکەمان لەبۆ برد، منداڵاّن دەورەیان دابوو، نانەکەی لێ بستێنن، ئەویش بە گۆچانەکەی لەخۆی دوور دەخستنەوە، بابم گووتی: خێرا نانی بۆ ئەو منداڵانەش ببەن، با لە یەقەی ببنەوە. حاجی نەجیب کوڕی حاجی تاهیر

چلبی، گێڕایەوە: جەمیل اغاو جەلیل اغا و ملا برایم و تاهیر چلبی باوکم و چەند کەسانێکی دی، لەسەر ئیجارە گرتن گیرابوون، هەر ئاغایە (٥ـ٦) دێی، لە حکوومەت بە ئیجارە دەگرت، حەمەاغاش بە کەفالەتی بابم، ئیجارەی گرتبوو، پارەکەی نەدابوو، لە جیاتی حەمەاغای باوکمیان گرتبوو، منیش چێشتم لەبۆ باوکم دەبرد، گەیشتمە ئاقاری نالبەندان، (پەلەفیرە) م لێ پەیابوو، مشکی (خۆڵەمێش) ی پێداکردم و قاپەکەی لێ فڕاندم و خۆی بە عەردیدادا، هەتا هەمووی نەخوارد قاپەکەی نەدامەوە، جارەکی دی چوومەوە ماڵ، خواردنی ترم لۆ بابم بردە حەپسخانە، بابم پێی گوتم: هەڕو بە حەمەاغای بڵێ: (بابم کەفیلە بۆچی حەپس بێ)؟ کەچووم بە حەمەاغام گووت: ئاغا بابم دەڵێ: (ئەمن لە سەرچ حەپس بم؟ حەمەاغا گووتی: هەرامە کوڕم بابت حەپس بێ چاکترە، ئەمن ئەو دەغڵەی نادەمە حکوومەت، بیدەمە فەقیران باشترە، بابت هەر بەردەبی)!.

هەموو ڕۆژێك چەند کێلە ئارد لە ماڵی حەمە ئاغا دەکرا نان، وە چێشتێکی زۆر لێدەنرا، بەسەر فەقیر و مزگەوتەکانا دابەش دەکرا، وە بە ستلۆکان بۆ ماڵە خزمەکانیشی دەچوو) .

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، (حەمە ئاغای کۆیە) بیرکردنەوەیەکی گەورەی هەبووە و پەرۆشی خەڵکەکەی خۆی بووە و بە زەیی پیادا هاتوونەتەوە، لە هەمانکاتدا خەڵکانی تریش هەروەك باسکراوە هەبوون، بە زەیی یان بە خەڵکەکەیاندا هاتووەتەوە.

**کۆیە ـ چنارۆك:** (حەماغای گەورە پیاوێکی چاو نەترس و خێرخوازێکی بێ وێنە بووە و لە کاتی سەفەربەلك و ساڵی گرانی گەورە، کۆیەو دێهاتەکانی توشی نەهامەتیەکی گەورە و برسی و قاتوقڕی دەبێ، حەماغا دەبێتە فریاڕەسی ئەو خەڵکە و هەرچی هەیەتی بۆ یارمەتیدانی خەڵك بەکاری دەهێنێ و ڕۆژانە نان و چێشتێکی زۆر لێدەنێ و دەرخواردی خەڵکی هەژاری دەدات، کە زۆرجاران ئەو خواردنانە بە دەستی خۆی بەسەر هەژاران دابەش دەکات) .

لە پەڕتوکی گەشتی ژیانم، لاپەڕە (٢٠)، مەسعوود محەمەد، باسی خێرخوازی و پیاوچاکی (حەماغای گەورە) ی کردووە، کە لە ساڵی (١٩١٧) بەهانای خەڵکی هەژار و لێقەوماوی کۆیە و ئەوانەی هاتونەتە کۆیە هاتووە، مەڕو ماڵاتێکی زۆری دەرخوارد داون، بۆ ئەوەی لە برسان نەمرن، ئەو زیاتر لە سەر پیاوچاکی حەماغا دەڕواو نموونەیەك لە هەستکردن لە بەرپرسیاریەتی و پیاوچاکی ئەو دەهێنێتەوە .

**دارا بەکر گردگۆزانی:** لەسەردەمی گرانییەکەدا، خەڵکێکی زۆری ڕۆژهەڵاتی کوردستان،لەبرسان ڕوویان لە گوندی گردگۆزان کردبوو،بەتەمەنەکانی گوند دەیانگێڕایەوە: (ئەوکات وەرزی بەهار بوو،جۆ گوڵی گرتبوو،لە قۆناغی فەریکی دابوو،ئێمەی خەڵکی گوند، هەموو شەوێك برسیەکانمان دەبردنە نێو یەکێك لە پارچە جۆیەکان، ئەوان هەتاکوو بەیانی لە نێو جۆیەکەدا دەمانەوە و فەریك جۆیان دەخوارد! بەڵام ئەو خواردنە دادی نەدان و چەند کەسێکیان لەبرسان

مردن، ژنێکیان لەگەڵ بوو بەناوی (سەید مەك)، شوی بە گاوانی گوندەکەمان کرد، کاتێ گرانییەکە کۆتایی هات، ئەوانەی لە مردن ڕزگاریان بوو، گەڕانەوە ڕۆژهەڵاتی کوردستان).

**ئەحمەد حسێن هەرتەلی:** کاکەسێنی باپیرم دەیگوت: (لە کاتی گرانییەکە، ماوەیەکی زۆر لە گوندی هەرتەلی خۆشناوەتی، خواردنم بۆ خەڵکی برسی ئامادە دەکرد، هەر سێ کوڕەکەم، لە بەردەرگای ماڵەوە برسییەکانیان ڕیزدەکردن. کە خواردن ئامادە دەبوو، برسییەکانمان یەك بە یەك بەنۆرە بانگ دەکردن و هەر یەکێك (ئەسکوێ) یەك خواردنمان بۆ لە قاپێك دەکردن و دەیانخوارد، جاری وابوو برسییەکان نۆرە بڕیان دەکرد و بە شەڕ دەهاتن، ئێمەش مەنجەڵی خواردنەکەمان پڕدەدایێ و دەچووینە ژوورەوە و دەرگامان دادەخست، ئێمە لە ژوورەوە، ئەوانیش لەدەرەوە، لە پێش پەنجەرەکە هەریەکێك قاپێکی لەدەستگرتبوو، لە ژوورەوە بە ئەسکوێ لە پەنجەرەکەوە خواردنمان بۆ لە نێو قاپەکان دەکردن، ڕوان ڕوانێك بوو بێهێزەکان دەکەوتنە بن دەست و پێ ....) .

گەر بیهێنینە بەر چاوی خۆمان، دیمەنێکی سامناك و سەرنج ڕاکێش دەبینین!.

**ئیبراهیم ئیبراهیم میاودەلی:** (لەو ڕۆژە ڕەش و تاریکەدا، (حاجی ڕەسووڵ ئاغای مەحمود ئاغا)، کە ئاغای گوندی گەرمکان بووە و خوا پێداویش بووە، لەم ژنە کۆچکردوانە و چەند ژنێکی تری گوندی گەرمکانی دانا بوون بۆ نان کردن، ڕۆژانە چەند تەشت هەویریان دەکرد بە نان و نانەکەش بریتی بوو لە ئاردی هەرزن و زوڕات و گەنم و جۆو شتی لەم بابەتانە و دەیانکردە ئەستوك، هەروەها

چەند ژنێکی تریشی دانابوو بۆ چەشت لێنان، چێشتەکەیش بە هەمان شێوە، نیسك و نۆك و ساوار بوو، پڕیان دەکرد لە ئاو، سێ ژەمە چەند پیاوێکی دانابوو بۆ ڕیزکردنیان، هەر یەکە و کەوچکێك چێشت و ئەستوکێکی دەدرایە، ڕۆژانە زیاتر لە (١٥٠) کەس، بەم شێوەیە خواردنی دەدرایە. دەنگ و باسی ئەم خواردنە بڵاو بووەوە و کۆچکەران دەستە دەستە و کۆمەڵ کۆمەڵ، دەهاتن بۆ گەرمکان و لەو زێیە دەپەڕینەوە، بەڵام زۆریان لە برساندا هێزیان نەمابوو و ئاو دەیبردن و دەخنکان، جگە لەو منداڵانەی کە دایك و باوکیان، دەهاتن لە ماڵی (حاجی رسو ئاغا)، فڕێیان دەدان و بە جێیان دەهێشتن، حاجی رسو ئاغاش چەند ژنێکی بۆ ئەو منداڵانە پەیدا کردبوو، بە خێویان دەکردن، هەروەها (بابەکری محمود ئاغا ی نورەدینی)ش، بە هەمان شێوەی (حاجی رسو ئاغای گەرمکان)، کۆچکردوانی بە خێو کردووە).

لێرەدا ماوەی هاوکاریکردنەکە دیاری نەکراوە، ئاخۆ چەند ڕۆژ یان مانگ و ساڵ بووە، پێدانی ڕۆژانە سێ ژەم خواردن بۆ ئەو هەموو خەڵکە، دەکرێ تەنها بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بووبێت.

**محەمەد عەبدوڵا سەرسیانی:** (لە کاتی گرانییەکەدا، خەڵکێکی زۆری ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە مەبەستی بە دەستهێنانی خواردن هاتونەتە گوندی سەرسیانی بەری مەرگە، چەند ماڵێکی خەڵکی گوندەکە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك خواردنی وەکو شلەساوار و گەنمە کوتا و ماش و نیسکیان بۆ لە ناو مەنجەڵاندا کوڵاندوون، خەڵکە برسییەکە هەندێکیان خەڵکی گوندەکە بوون، بە ڕیز یەك لە دوای یەك

ڕیز بوون و بە نۆرە چوونەتە پێشیێ و هەر یەکێك بادیەیەك خواردنی دراوەتیێ و خواردویانە و ڕۆیشتوون) .

**مەلا ڕسووڵ حەمەد وەرتی:** دایکم لەو سەردامدا ژیابوو، بەو شێوەیە بۆی گێڕامەوە: (خەڵکێکی زۆری برسی کە پێك هاتبوون لە پیاوی بە تەمەن و ژن و منداڵ و گەنج، ڕوویان لە گوندی وەرتیێ کرد، ئەوەندە لەڕو لاواز بوون! برسیەتی هیلاکی کردبوون، ئێمەش بەپێی توانا خواردنمان دانیێ. ڕۆژێك پیاوێکی لاواز و بێ هێز هاتە ماڵی ئێمە، داوای نانی کرد، منیش نانێکم بۆ تەڕکردو کابرا هێندەی برسی بوو، نانەکەی لولداو دەزاری ئاخنی! دەرفەتی جوینی بۆ خۆی نەهێشتەوە، بۆیە هەناسەی گیراو هەر لەویێ لەبەر چاوی ئێمە مرد) .

ئەو گوندە هاوسنورە لە گەڵ ناوچەی بیتوێن ، لە پێشدا باسی هاتنی ئاوارەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستانمان کرد بۆ ئەو ناوچەیە.

**عەنبەر حەمەد بێتواتی:** گرانیەکە کارەساتێکی سامناك بووە! (مامە حەم) ی باوکم دەیگێڕایەوە: (لە هەرەتی قات و قڕیدا، هەموو بەیانیەك (من و عالیاغا) ماڵ بە ماڵی گوندی بێتواتە دەگەڕاین. ئەوانەی لە برسان کەوتبوون و ئومێدی ژیانمان پیێ مابوون، هەر یەکێکمان چەند کەسێکمان لەوانە دەبردنەوە ماڵی خۆمان و خواردنمان دەدانیێ، هەندێکیان دەمردن و هەندێکیشیان هەڵدەستانەوە).

لە گوندی بێتواتە (حەمەد نابۆ) ش، هاوکاری خەڵکی برسی کردووە، وە خەڵکی گوندی کۆدەڵەش، خواردنیان بە سەر خەڵکی برسیدا دابەش کردووە .

**تاریق جامباز:** (ساڵی گرانی لە جۆزەردان تا جۆزەردان هەر گرانی بوو.ئەو کاتە چاڵی گەنم نەبوون،چاڵی گەنم ببوو بە هەمبان، هەر هەمبانیان بە کار دەهێنا ،چونکە خەڵك بە هەمبانیش گەنمی نەبوو، خەڵکێکی زۆر هەموو ئێواران، لە گوندی بلەی ژۆری خڕدەبوونەوە، لە هەموو گوندەکانی دەوروپشتی بلە دەهاتن بۆ نان خواردن، چەند ژن شیویان لێ دەنا،یان ماش یان ساوار و هیتر بوو، لە خواردنی سادەو ساکار، هەر نەفەرەی دوو سکۆی ماشیان بۆ تێدەکرد، یان هەرچی کە هەبایە.سەرپەرشتی ئەم خواردن چاك کردنە دایکە (حەبیبە) خێزانی شێخ بوو، کە دەکاتە دایکی (شێخ نەجیم)، ژنێکی قورئان خوێن و دلایل خوێن بوو....).

لێرەدا مەبەست لە گوندی (بلە) ی ناوچەی هەروتیە بوە (دایکە حەبیبە) خێزانی (شێخ کاکە مینی سەران) بووە، ئەو کاتە ماڵیان لە گوندی بلەی ژۆری بووە لە دۆڵی مەلەکان .

**ڕەسوڵ حەسەن بالیسانی:** (ماڵی (عەزیز بەگ) لە گوندی بالیسانی خۆشناوەتی ناندەرو دەوڵەمەندبوون، لە کاتی گرانییەکەدا، چەند ڕۆژێك خواردنیان لە نێو مەنجەڵی گەورەدا کولاندووە و ئامادە کردووە، (خەجیج خان) بە ئەسکوێ خواردنی بەسەر خەڵکی برسیدا دابەش کردووە، کە بە ڕیز ڕاوەستاون و نۆرەیان گرتووە بۆ وەرگرتنی خواردنەکە) .

**میر ئەحمەد میر:** (لەو کاتەدا خەڵکێکی زۆری ڕوت و برسی لە ناوچەکانی دەوروبەرمان بەتایبەتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ڕویان لە ناوچەی بیتوێن کردووە، لە گوندی سەرکەپکانی دۆڵی شاوریٚ، ئەو ماڵانەی هێشتا برسیەتی تەنگی پیٚ هەڵنەچنی بوون، بۆ چەند جارێك مەنجەڵی گەورەی پڕ لە ماشیان کولاندووە و ماشەکەیان بە سەر خەڵکی برسیدا دابەشکردووە،بۆ ئەوەی لە برسان نەمرن،برسیەکان نۆرەیان گرتووەو خاوەن ماڵیش خواردنی بە ئەسکوٚیٚ بۆ لە نێو قاپیان کردون و خواردوویانە،ماڵی باوکم یەکێك بوون لەو ماڵانەی،کە هاوکاری خەڵکی برسی و لێقەوماویان کردووە) .

**حوسێن حەمید خەتی و نوری بەکر خەتی:** (پیاوێکی گوندەکەمان بەناوی (مەلا فەتاح) پێش گرانییەکە ماڵی لە گوندی دیبەگەی دەشتی هەولێر بووە،لەویٚ مەلایەتی بۆ خەڵکی گوندەکە کردبوو شەوێك لە خەودا بینی بووی برسیەتیەکی زۆر دژوار ڕوودەدات،بۆیە بڕیاری دابوو بگەڕێتەوە گوندی خەتێی خۆشناوەتی و لەلای خزمەکانی بژیت، دووسەد بارە گەنمی بە پشتی ولاٚغ لەگەڵ خۆی هێنابوو،کە گرانییەکە ڕووی دابوو،هەموو بەیانییەك خواردنی داوەتە پەناهەندە برسییەکان،هەموو ئەو خۆراك و مەڕوو ماڵاتەی هەیبووە دەرخواردی خەڵکی برسی داوە) .

لێرەدا پێدەچێت ژمارەی پەناهەندە برسییەکان زۆر بووبن، دوو سەد بارە گەنم ژمارەیەکی زۆرە. خواپێداوە بە ویژدانەکان، دەرگاکانیان لە دیوی ژوریٚ داخستووە

و لە کونی دۆزیخەی دەرگاکانەوە، خواردنیان داوەتە خەڵکی برسی و لێقەوماو کە لە دەرەوە چاوەڕێی خواردنیان کردووە. دەکرێت لە ناوچەکانی تریش، خەڵکانێی دەوڵەمەند و دەستکراوە هەبووبن، کە هاوکاری خەڵکی برسی و لێقەوماویان دابێت.

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** (ئەو برسیەتیە وای لە یەکێکی وەکو (سمکۆ) کرد، کەسی دەست نەکەوت لە چیا زێتر پەنای وەبەر ببا، بۆیە داوای یارمەتی لێ کرد، ڕووی لە چیاکان کرد و هاواری کرد: فریای میللەتی کورد بکەون، کە لەو شاخانەدا لە برسان ناچار بوون گیا دەخۆن.... من چی بکەم دەنگم بگەیەنمە پاریس، بۆ ئەوەی فریای میللەتی کورد بکەوێ، تۆ ـ واتا چیا ـ لە جیاتی ئێمە دەنگمان بگەیەنە بەو وڵاتانە و داوای ناردنی خواردنیان لێ بکە، پێویستیمان بە قوتابخانە هەیە، پێویستیمان بە هەموو شتێك هەیە، کە بەرەو شارستانیمان ببات، من باوەڕم بە ڕووس و تورك و ئێران نییە، ئێوەن هیوای ئەوەتان لێ بکرێت، یارمەتی کورد بدەن).

لێرەدا، مەست لە (سمکۆی شکاك)ە، کە سەرکردە و شۆڕشگێڕێکی ناوداری کورد بووە و سەرۆکی هۆزی شکاکیش بووە .

**جەرجیس فەتحولا:** (تەنانەت ئەو ئاشووریانەش کە غەدری سمکۆ کە لە سەرکردە دیانیەکەیان ـ الزعیم الروحی ـ مارشمعون و دەستو پەیوەندەکەی کرد، هێشتا هەر لە بیریان بوو، بەڵام هەستی مرۆڤانەیان جووڵاو لە گەڵ کوردەکاندا

هەرچییەکیان هەبوو لە خۆراك و پۆشاك بەشیان کردو لای کۆمەڵەی بە هاناوەچوونی ئەمەریکیدا ـ لجنە الاغاپە الامریکیە ـ هەولێیان بۆ دەدا. ئەمەش قسەی ئەمریکیەکە کە بە چاوی خۆی هەموو شتێکی دیبوو (اسقف) و گەورە پیاوەکانیان تکایان لە ئەمریکیەکان کرد، کە ئەو کوردە لێقەوماوانە یارمەتی بدرێن، ئەگەر دۆست بن یان دوژمن) .

**ئیحسان رەشاد موفتی**، باسی پیاوێکی شاری هەولێر دەکات بەناوی (شێخ جەمیل ئەفەندی)، کە هاوکاری خەڵکی برسی کردووە، وەها نوسیویەتی: (لە گرانی شەڕی یەکەمی جیهانی (١٩١٧)، رۆڵێکی بێ وچانی هەبووە بۆ رزگارکردنی خەڵکی شار و دەوروبەری شاری هەولێر و ئەوانەی رویان لە هەولێر کردووە، گشت سامانی بن دەستی لە پارەوپوول و ئەو چاڵانەی لە دەشتی هەولێر بۆ گەنم و جۆ پاراستبووی هێنایە دەرەوە، لە قەڵای هەولێر بە پشتگیری ئامۆزاکانی (مەلا ئەفەندی، محەمەد موفتی، ئەحمەد ئەفەندی)، سێ مەنجەڵی گەورە لە پانی دوو مەتر کە بۆ کولاندنی گەنم هاوینان بە کار دینن بۆ دروستکردنی ساوار، لە ناوەڕاستی مزگەوتی قەڵاو لە پێش ماڵی خۆی کە ئێستاش لە قەڵا ماوە و هەروەها لە خوار قەڵات لە حەسارەکەی خۆی، کە ئێستاش جێ و شوێنی ماوە و نزیك گۆڕەپانی کۆتری ئاشتییە، دوو جەمە شۆربای بەسەر هەژاران و برسییەکانی شاری هەولێر دابەش کردووە، لەو دوو کارەساتە شێخ جەمیل ئەفەندی و ئامۆزاکانی لە مزگەوتی قەڵا، رۆژێك دوای نوێژی هەینی بە ئامادەبووان دەڵێ: کەی من برسی بووم مانای ئەوەیە ڕوبە گەنمێك بۆ

خۆم و خێزانەکەم نەماوە، هەموو دانیشتووانی هەولێر لێوەوەك برای منن، ئەوەی هەمە لە ڕاهی خودا دابەشی دەکەم. ئەوە بوو قسەکانی هێنایە جێ و بەردەوام بوو، شێخ عەدنان نەقشبەندی کە حەفیدی شێخ حوسامەدین نەقشبەندییە، ڕۆڵی شێخ جەمیل ئەفەندی بەرز دەنرخێنێ، کە هەردەم لە ناو خەڵك باسکراوە، شێخ جەمیل ئەفەندی کە گەنم و جۆی دابەش دەکرد، لە هەمان کاتدا یارمەتی پارەی دەبەخشییە مامۆستایانی گوندەکانی شاری هەولێر تا ئەوان قورسایی نێو دانیشتوانی گوند کەم بکەنەوە، بە ڕاستی پیاوی وەك شێخ جەمیل ئەفەندی وێنەی کەمە، دەرگای قەلاّی هەولێریەکانی دانەخست لە بەردەم هەژاران وەك والی موسڵ. وە لە سەر زاری ژنێك بەناوی (حاجی زولەیخا)، لە باسی گوندی قۆریتانی باشوری هەولێر نوسیویەتی: بە شەو هەویرمان دەشێلاو ئەستورکە نانمان دەکرد بە ژمار،ئەو تورکانە کە دەهاتن یان خەڵکی برسی دەهات،پارەوە نانێکمان پێ دەبەخشین) .

گەر لێکۆڵینەوە و بە دوادا چوونی زیاتر بکەین، خەڵکانی تریش هەن کە لە شاری هەولێردا هاوکاری هەژار و لێقەوماویان کردووە .

**مەهدی محەمەد قادر:** (بە مەبەستی یارمەتیدان و چارەسەرکردنی ئەم بارودۆخە ترسناکەی، کە بوو بووە سەرچاوەیەکی هەڕەشە بە سەر ژیانی هەژارانی شارەکە، هەندێك لە بنەماڵەکانی هەولێر، یارمەتی زۆری هەژاران و لێقەوماوانیان داوە، وەك (حاجی ڕەشید ئاغا)، کە جگە لە یارمەتیدانی خەڵکی هەولێر، ئەم

خێزانانەی کە لە ناوچەکانی مەندەلی و دەوروبەری کەرکوک، بە هۆی شەڕەکەوە ناوچەکانیان جێهێشتووە، لە هەولێر نیشتەجێ بوون، یارمەتی داون و جێگای حەوانەوەیان بۆ دابین دەکات، هەروەها (حسن ئاغا چاوشلی)، بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی دەهێنێتە بازاڕ و بە نرخێکی هەرزان دەیفرۆشێتە هەژاران و ئەوانەی توانای کڕینیان نەبووە، بە بێ پارە وەرگرتن دابەشی کردووە بە سەریان، کە ئەمەش بووەتە هۆی کەمکردنەوەی ئەم برسیەتیەی کە خەڵکی کەم دەرامەت تیایدا دەژیا، هەروەها (جەمیل ئەفەندی ۱۸۷۸ ـ ۱۹۱۹ ز)، کە موفتی هەولێر بووە، ڕۆڵێکی گەورەی ناندانی هەژارانی هەولێر و پەڕاگەندەکانی شارەکانی تری داوە، کە بە هۆی شەڕەکەوە ڕویان کردبووە هەولێر) .

**سابیر ئیبراهیم عبدولاّ خەتی:** (لە گوندی شێخ مەمودیانی خۆشناوەتی، پیاوێك هەبووە بەناوی (قەرەنی)، ئەو پیاوە دەوڵەمەند بووە و لە شاخی بەنی هەریر خۆراکێکی زۆری حەشارداوە، کاتێ برسیەتی پەرەی سەندووە، خەڵکێکی زۆری پەناهەندە، ڕویان لە ناوچەکە کردووە، ئەو چەند ڕەشماڵێکی هەڵداون و هەر ڕۆژێك خواردنێکی لە ژێر ئەو ڕەشمالانەدا، بۆ خەڵکی برسی ئامادەکردووە و بە سەریدا دابەشکردون، تا باس لەوەش دەکرێت: هەموو ڕۆژێك ئاژەڵێکیشی کوشتووەتەوە و گۆشتەکەی بەسەر برسیەکاندا دابەشکردووە) .

**حەلیمە شێخ کەمال سەرانەیی:** (خێزانێك کە خەڵکی (ورمێ)ی ڕۆژهەلاّتی کوردستان بووە، (دایك و باوك و دوو کچۆڵە)ی بچووك بوون، هاتونەتە گوندی

سەرانی نزیك ڕواندوز، دایك و باوکەکە هەر زوو مردوون! ئەو کات (مەلا عەبدولاّی پیری کۆسە) مەلای گوندەکە بووە و حوجرە و فەقێی هەبوون، هەردوو کچەکەی تایبەت کردوون بە خزمەتکردنی حوجرە و بەخێوی کردون) .

هەرچەندە لە هیچ سەرچاوەیەکی نوسراو کە ئێمە خوێندبێتمانەوە نەمان بینیوە، بەلاّم باس لەوە دەکرێت: لە سالّی (١٩١٨) بەر لەوەی بگەنە سلێمانی، (شێخ محمودی حەفید) لە سلێمانییەوە داوای لە ئینگلیزەکان کردووە، فریای خەلّکی سلێمانی بکەون و هاوکارییان بکەن بە خواردن و جلوبەرگ و ...هیتد .

## پەراوێز:

ئیبراهیم ئیبراهیم میراودەلی، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی میراودەلی پشدەر)، بەرگی یەکەم، لاپەڕەکانی (١٣٨).

ئیحسان ڕەشاد موفتی، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر - مێژووی کۆن، مێژووی ئیسلام، مێژووی نوێ) لاپەڕە (١٣٣٠).

ئەحمەد حسێن ئەحمد هەرتەلی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ١٥/٦/٢٠١٩ لە گوندی هەرتەل.

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم لاپەڕە(١٣٤).

تارق جامباز، (نادارانی دەفەری سۆران - شێخ کاکەمینی سەران ١٨٧٤ - ١٩٤٠)، لاپەڕە(٣٢).

جەرجیس فەتحولا، (ڕاپەڕیوونەوەی کورد - مێژووی سیاسی ١٩٠٠ - ١٩٢٥)، بەشی یەکەم لاپەڕەکانی (١٠٢ و ١٠٣).

حوسێن حەمید خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٨/٩/٢٠١٢ لە گوندی خەتێ.

حەلیمە شێخ کەمال سەرانەیی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٥/٢/٢٠٢٠ لە شاری هەولێر.

دارا بەکر گردگۆرانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٤/٨/٢٠١٢ لە شارۆچکەی چوارقوڕنە.

ڕەسوڵ حەسەن بالیسانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ١٥/٩/٢٠١٢ لە بالیسان.

سابیر ئیبراهیم عبدولا خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢١/٢/٢٠٢٠ لە شاری هەولێر.

عەنبەر حەمەد بێتواتی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٧/١/٢٠١٨ لە شاری هەولێر.

کۆیە - چنارۆك، (نادارانی کۆیە)، لە (٢٩) ی ئۆکتۆبەری (٢٠١٨).

کامەران ئەحمەد محمەدئەمین، (کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا)، لاپەڕە (١١٢).

محەمەد عەبدولا سەرسیانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ١٢/١/٢٠٢٠ لە شارۆچکەی سەروچاوە.

میر ئەحمەد میرە، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٦/١/٢٠١٢ لە گوندی (قەلاسەید) ی دۆڵی شاورێ.

مەلا ڕسوڵ حەمەد وەرتی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٥/٩/٢٠١٩ لە گوندی وەرتێ.

مەهدی محمد قادر، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر)، لاپەڕە (١٤٩١ - ١٤٩٢).

نوری بەکر عەبدولا خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٨/٩/٢٠١٢ لە گوندی خەتێ.

## پێنجەم: خواردنی گژوگیاو فەریك جۆو ...

زۆرن ئەو گژوگیایانەی شیاوی خواردن، ئایا ئەوان دەتوانن جێگەی دانەوێڵە بگرنەوە، بۆ بەردەوام بوونی مرۆڤ لە ژیاندا؟ بۆ دەستکەوتنی ئەو وەڵامانە، با گوێ بیستی ڕووداوەکان بین.

**تاهیر احمد حەویزی:** (زۆر کەس بە گیاوگۆڵی دەژیان، هەتا جۆ فەریك بوو، خەڵك دەچوون بە داسوکەی گوڵەکەیان هەڵدەبڕی و هەڵیاندەگلۆفت، زۆر کەس لەسەری کوژران. بەهاری گرانی کەنگر یەکجار زۆر بوو، وە بەهارەکەی درێژکردەوە، کەنگر تا درەنگ پیرنەبوو، زۆرکەس کەنگری دەکولاند و پێی دەژیا. هەبوو سمرکە وەیا گۆرمزەی دەکولاند و دەیخواردەوە، هەندەی پێ نەدەچوو دەمرد).

**حوسێن مستەفا سوێری:** نەنکم ناوی (عائیشە) بوو دەیگێڕایەوە: (کاتێ کە گرانی داهات، ئێمەی خەڵکی گوندی سوێرێی خۆشناوەتی، دەچووینە شاخەکانی دەوروبەری گوندەکەمان، کرۆسك و گێوژمان دەخواردن، بەری (زی) مان دەکوتا و دەمانخوارد) .

**ئی.جەی.ئاڕ:** (قات و قڕیەکە ئەوەندە خراپ بوو، بەڕادەیەك هەندێ شوێن، دانیشتوانەکەی بەتەواوی لە سەر گژوگیاو چەند بەرووبەکی بەجێماو دەژیان) .

لێرەدا باسی سەرەتای گەیشتنی هێزی ئینگلیز دەکات، لە ساڵی (١٩١٧) لە بەغداد بۆ باشوری کوردستان، لە باسی شاری ڕواندوز و دەوروبەری .

**محەمەد عەبدولا سەرسیانی:** (لە وەرزی بەهاردا ئەوکاتەی جۆ گوڵی گرتووە، خەڵکی گوندەکانی بەری مەرگە، ڕۆژانە لە ئاوایییەکانیان چونەتە دەرێ و ڕویان لە دەشت و دۆڵ و شاخەکان کردووە و گژوگیا و فەریك جۆ (جیقە) یان خواردووە).

**فازڵ هاودیانی:** (لەو ساڵەدا خەڵك بەری ستری وشك دەکرد و دەیانکردە ئارد و نان، هەرکەس تالە و هەرزنی هەبا، وە یان چێلێکی هەبا، لە قاتو قڕی دەربازی دەبوو) .

**ئیبراهیم ئیبراهیم میاوەلی:** (خەڵکی ناوچەی خۆشمان، بە هۆی هاتنی ئەم ئاوارانەوە، توشی قات و قڕی بوون و بەڕوو و بەری (زی) و بەرە (خڕبوك ـ خڕنوك) و جۆ و زوڕات و هەرزن و گەلێك شتی لەو بابەتەیان تێکەڵاو کردووە و ئینجا لە ئاشیان کردووە و هاڕیویانە و کردویانە بە نان و خواردویانە) .

لێرەدا مەبەست لە ناوچەی پشدەرە، کە دەکەوێتە باشوری کوردستان، خەڵکێکی زۆری ئاوارەبووی ڕۆژهەلاتی کوردستان ڕوویان لەو ناوچەیە کردبوو.

**هاوکار عبداللە شێخ وەسانی:** (مامۆستای گەورەی کۆیی لە تەفسیری ئایەتی (٥٧) ی سورەتی بەقەڕەدا، (کلوا من گیبات مارزقناکم)، دەڵێت: ئەو ڕزقە پاکەی کە بۆمان ناردن، لەو نەباتات و بەری دارانە، کە لە ئەرز بۆمان خەلق کردون بخۆن، زاتەن کێوی (تور)، وەکو (کۆسرەت) و چیای (سەفین) ی ئێمە، چیایەکی بە گیاو داروبارە، ئەنواعی خۆ ڕسی تیادا هەیە...، گەلێ کەس بەو مەوادی تەبیعییە ئەژی، حەتا لە ساڵی (١٣٣٦)، ئەکسەری ئەهالی بە کەنگر و ئەمسالی وی، زۆر چاك ژیان، لە مردن دەرچوون) .

دیارە لە بەهاری ساڵی (١٣٣٦) هیجری، کە دەکاتە (١٩١٨) زاینی، لە کۆیەو دەوروبەری باران باریوە. وە لێرەدا ئەوەمان بۆ پشتڕاست دەبێتەوە، کە مەلای گەورەی کۆیە لە دانیشتنێکدا گوتوویەتی: (ئەگەر کورد ئاڵای هەبێت، دەبێ نەخشی کەنگری لە سەردابنێین) .

## پەراوێز:

ئی.جەی.نار، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، لاپەڕە(٤٩).

ئیبراهیم ئیبراهیم میاوەدلی، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی میاوەدلی پشدەر)، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٤٠).

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم،لاپەڕە(١٣٢ و ١٣٦).

حوسێن مستەفا سوێری، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ١٤/١٢/٢٠١٧ لە کۆمەڵگای شکارتە.

فازڵ هاوردیانی، (هاوردیان)، لاپەڕەکانی(٢٩ ـ ٣٠).

محەمەد عەبدوڵا سەرسیانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ١٢/١/٢٠٢٠ لە شارۆچکەی سەروچاوە.

هاوکار عبداللە شێخ وەسانی، (دین و جیهانبینی مەلای گەورە)، کتێبی ـ ١ ـ لاپەڕە (١٧٥) .

## شەشەم: خواردنی گۆشتی ئاژەڵی مردار و تۆپیو

کاتێ برسیەتی تەنگ بە مرۆڤ هەڵدەچنێ، مرۆڤ ناچاردەبێ پەنا بۆ بەر کرداری نەشیاو و ناخهەژێن بەرێت، کە لە دۆخی ئاسایدا بە خەیاڵیش بیری لێ نەکردووەتەوە، لێرە بە دوا با گوێ بۆ ڕووداوەکان بگرین، با بزانین خەڵکی برسی لە چ بارودۆخێکدا بوون!.

**ئی.جەی.ئار**: (لە هەندێك شوێندا، دانیشتوانەکەی لە برسان، بە ناچاری پشیلەو سەگیان دەخوارد) .

لێرەدا مەبەستی ڕواندز و دەوروبەریەتی، باسی سەرەتای گەیشتنی هێزی ئینگلیز دەکات، لە ساڵی (١٩١٧) لە بەغداد بۆ باشوری کوردستان.

**ئیحسان ڕەشاد موفتی**: (لە گرانی گەورە، خەڵکێکی زۆر لە کوردستانی باشووریش، ڕوویان لە شارۆچکەکانی باشور کرد، کە گرانیەکە بە جۆرێك بووە، لە زۆر شوێن ڕوویان لە خواردنی گۆشتی کەر و سەگ و پشیلە کردووە) .

لێرەدا مەبەست لە ساڵی ١٩١٧ ی شاری هەولێرە .

**نەجمەدین شێخ کەریم**: (هەر ئەو برسیەتیە بوو، کە بووە هۆی خواردنی گۆشتی سەگی تۆپی و پشیلەی مردار بوو) .

**محەمەد حەسەن سەرگەینێلی**: (خەڵکی ناوچەکەش، ژیانیان کەوتە مەترسی و لێیان بڕاو خواردن و خواردنەوەیان نەدەدانێ، ناچاربوون دەستیان کرد بە خواردنی

وولاّغی تۆپیوو مردار بوو، تاوای لێ هات مرداربووش نەما، ئینجا کۆمەڵ کۆمەڵ پەلاماری مالاّنیان دەدا، بۆ سەندنی خواردن و خواردنەوە) .

لێرەدا مەبەستی لە ناوچەی پشدەرە. وە سەبارەت بە ئاوارەکانیش، مەبەست لە ئاوارەکانی ڕۆژهەلاّتی کوردستانە .

**یوسف محەمەد کانی بەردی و حەسەن حوسێن کانی بەردی:** پیاوێکی بەتەمەنی گوندی کانی بەردی خۆشناوەتی، بە ناوی (حوسێن) دەیگێڕایەوە: (ڕۆژێك باوکم گوێدرێژەکەی لە نێو لەوەڕگا لە نزیك ئاوایی بەستبۆوە، لەو کاتەدا پێیان گوت: چەند کەسێکی برسی هاتن و گوێدرێژەکەیان بەڕەلاّ کردی و بردیان، ئەویش دوایان کەوت، لەو شوێنەی پێی دەڵێن (خدر خەزا)، لە نێوان بالیسان و کانی بەرد، چوار کەسی بینی بوو کەرەکەیان کوشتبۆوە و گۆشتەکەیان بە تازی خوارد بوو، ئەوانە لە ناوچەیەکی ترەوە هاتبوونە خۆشناوەتی) .

**عائیشە مەلا خدر بێتواتی:** (خێزانێکی خزمان ماڵیان لە گوندی بۆسکێنی ناوچەی بیتوێن بوو، (فاتیمە)ی نەنکم دەیگێڕایەوە: (ڕۆژێك لە گوندی بێتواتەی خۆشناوەتییەوە سەردانم کردن، کاتێك گەیشتمە نزیك گوندی بۆسکێن، پیاوێکی ڕوت و لاوازم بینی دەمی لە کەلاکی گوێدرێژ (کەر) یکی تۆپیو نابوو و گۆشتەکەی دەخوارد! منیش پێم گوت: دە هەر بمرە، دە هەر بمرە، مەخۆ گۆشتی کەرێ، بمری باشترە) .

برسیەتی تینی بۆ فاتیمە نەهێناوە، هەر بۆیەش هەستی بە ئازاری برسیەتی ئەو پیاوە داماوە نەکردووە.

**پەیسەر پرلس:** (کەسانی هەژار لە دۆخێکی زۆرخراپتر دەژیان، بۆیە پەنایان بردە بەر خواردنی سەگ و پشیلە، تاوەکو تاقیان بڕی و لەو شاردا سەگ و پشیلە نەدەبینرا. گرانی و قات و قڕی و نەبوونی خۆراك ئەوەندە کاریگەری دروستکردووە، هەندێك جار مرۆڤ ناتوانێت بیری لێ بکاتەوە، بەپێی ووتەی ئەو کەسانەی بە چاوی خۆیان ڕوداوەکانی ئەو سەردەمانەیان بینیوە دەیگێڕنەوە کە لە ناو شاری موسڵدا پشیلەیەك چووتە ماڵێکەوە ژمارەیەکی زۆر خەڵك شوێنی کەوتون و لەولا بۆ ئەولا فڕاندوویانە تاکو گرتوویانەو دواتر خواردویانە) .

**مەلا ڕسوڵ حەمەد وەرتی:** دایکم بەو شێوەیە بۆی گێڕامەوە: (خەڵکی پەناهەندە ئەوەندە زۆر بوون کە هاتنە گوندەکەمان نەمان توانی هەموویان نان بدەین، ڕۆژێك گوێدرێژێك و سەگێك لە دەرەوەی ئاوایی تۆپیبوون، هەرچەندە بۆنیش بوو بوون، کە برسیەکان پێیان زانی، بە ڕاکردن چوونە سەر کەلاکەکان و گۆشتە بۆگەنیوەکەیان خوارد) .

**ممدوح مزووری:** (قاتیەکە گەیشتبۆ ئەو رادەیە، (کیسەڵ و مردار و کسوك) یان ئەخواردن) .

**حوسێن حەمید خەتی و نوری بەکر خەتی:** پیاوێکی گوندەکەمان بەناوی (حاجی محەمەدێ حەلێ) دەیگێڕایەوە: (ڕۆژێك لە گوندی خەتێ، سێ کەسی برسیم بینی، (تاژی) یەکی تۆپیویان لێك دەکێشایەوە و گۆشتەکەیان دەخوارد! لێیان نزیك کەوتمەوە و پێم گوتن: ئەوە گۆشتی ئاژەڵێکی ئاوەگر و تۆپیو دەخۆن ؟! ئەوان

زاریان لێ خوار کردم و بەشێوەیەکی مەترسیدار قیژاندیان بە سەرمدا! منیش ترسام و هەلاتم) .

لەبەرگی یەکەمی پەرتوکی خۆشناوەتی لە سەدەی بیستەمدا، چەندین ڕوداوی هاوشێوە و، بەلّك و تراژیدی تریش تۆمارکراون.

**حەلیمە شێخ کەمال سەرانەیی:** (ژنێکی بە تەمەنی گوندی سەران بەناوی (حەلیمە مامە شێخ)، دەیگێڕایەوە: خەلّکێکی زۆری ڕۆژهەلاّت و باکووری کوردستان ڕوویان لە گوندی سەرانی نزیك ڕواندوز کرد، لە برسان پەلاماری هەموو شتێکیان دەدا! پشیلە، سەگ، گوێدرێژ، هەرچی دەستیان کەوتبایە دەیانکوشت و گۆشتەکەیان بە خاوی دەخوارد ) .

**محمد رسول هاوار:** (برسیەتی گەیشتبووە ڕادەیەك، خەلّك ناچاربوو گۆشتی مردوو بخوا، بەو جۆرە لە سالآنی یەکەم و دووەمی شەڕی جیهانی یەکەمدا، ئەرمەنەکان چییان بەسەرهات، کوردەکانیش لە ماوەی یەك دوو سالّدا، توشی هەمان کارەسات و مالّ وێرانی بوون).

**جەمال بابان:** (خەلّك لەتاوان گۆشتی ولاّغ، بگرە گۆشتی (ئاژەلّی تۆپیو)یان دەخوارد ) .

**عەزیز قادر بێناتانی:** (لەو سەردەمدا خۆراك قاتی بووە، خەلّك ناچار بووە گۆشتی ئاژەلّی تۆپی و مرداربوو بخۆن) .

## پەراوێز:

ئی.جەی.نار، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، لاپەڕە (٤٩).

ئیحسان ڕەشاد موفتی، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر)، لاپەڕە (١٥٥٦) .

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان....)، گۆگڵ، ڕۆژی ٣١/٧/٢٠١٩.

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەم) بەرگی یەکەم و دووەم،لاپەڕە(٥٢)

حوسێن حەمید خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٨/٩/٢٠١٢ لە گوندی خەتێ.

حەسەن حوسێن کانی بەردی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢١/٩/٢٠١٢ لە گوندی کانی بەرد.

حەلیمە شێخ کەمال سەرانەیی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٥/٢/٢٠٢٠ لە شاری هەولێر.

عائیشە مەلا خدر فەقێ عەبدوڵا بێتواتی، لە ڕۆژی ٤/٥/٢٠١٨ لە شاری ڕانیە.

عەزیز قادر بێناتالی، چاوپێکەوتن لە ٢٧/٤/٢٠١٢ لە گوندی وەرێ.

م.محەمەد حەسەن سەرگەینێلی، (هۆزی ئاکۆ ... ) لاپەڕە (٣٩٩).

مەلا ڕسوڵ حەمەد وەرتی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٥/٩/٢٠١٩ لە گوندی وەرتێ.

ممدوح مزووری، (مێژووی ڕواندز)، لاپەڕە (٢٨٨ ـ ٢٨٩).

محمد رسول هاوار، (کورد و باکوری کوردستان)، لاپەڕە (٥٤٩)

ئوری بەکر خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٨/٩/٢٠١٢ لە گوندی خەتێ.

نەجمەدین شێخ کەریم، (شەڕی جیهانی یەکەم ١٩١٤ ـ ١٩١٨ ز)، گۆڤاری (k٢١) لاپەڕە (٦٧)

فەیسبوك.

یوسف محەمەد کانی بەردی، چاوپێکەوتن لە ٢١/٩/٢٠١٢ لە گوندی کانی بەرد.

## حەوتەم: خواردنی گۆشتی مرۆڤ، خواردنی قورس

دەتوانین چەندین نموونە بهێنینەوە، سەبارەت بە خواردنی گۆشتی مرۆڤ! لە کاتی برسیەتیدا، لەلایەن ئاژەڵە دڕندەکان و خودی مرۆڤەکانیشەوە، هەوڵدەدەین لێرەدا چەند نموونەیەك تۆمار بکەین .

**نازەنین محمد وهبی و ئەوانی دیکە:** (لە ناو برسیەتی خەڵك گۆشتی مردوی مرۆڤ و ئاژەڵی دەخوارد ) .

**تاهیر احمد حەویزی:** (کەریم چاو سۆری دەباخچی گێڕایەوە: سێ کەس هاتنە دەباخانان، دوویان ئەویدیان لە عاردیداو خواردیان، دوایی دووەکەی دیش ملیان لەبەر ملی یەکدینا و ئەوی بەهێزیان ئەوی دی خوارد، وە منداڵێك هاواری کردمێ: مامە بمگەیێ ئەوە دەمخوا، منیش کەچووم کابرا گوتی: ئەتو حەقت چیە؟ کوڕی خۆمەو دەیخۆم! سبەینێ کە چوومەوە ناو خانوەکە، هەندێ پەنجەی لێ کەوتبوو!!!!. کچێکی عازەب لە گرانی لە برسان، لەبن قادرمەی مزگەوتی (حاجی مەلا ئۆمەر) مردبوو، سە مەمکی دەخوارد، جووتە گوارەی لە گوێ بوو، بازنی زیوی لە دەست بوو. ئافرەتێك منداڵی دەبێ، منداڵەکەی لەناو مەنجەڵێکی دەنێ و ئاوی تێدەکاو لەسەر ئاگری دادەنێ، منداڵەکەی دەخوا!. هەبوو ئێسکی خرِدەکردەوە و دەیخستە سەر ئاگری و ڕژوەکەی دەخوارد!. کابرایەك لە چنارۆك، ڕەگەدارێکی لە دەمی خۆی نابوو دەیمژی، کە مردبوو دارەکەی هەر لە دەمدابوو).

ئەو ڕوداوانە هێندە ناخ هەژێنن، بە بیستنیان مرۆڤە ژیرەکان وەکو پەند ئامۆژگاری، دەتوانن سودی لێ ببینن.

**عومەر ئەحمەد خدر مەلەکی:** (لە سنوری مەنگوڕایەتی ناوچەی پشدەرەوە، خەڵکێکی زۆر لە برسان ڕوویان کردووەتە ناوچەی خۆشناوەتی، هەندێکیان هاتونەتە گوندی مەلەکان، هەریەکێك عەبالەیەکی شڕو شەپڕێوو دڕاوی دەبەردابووە، زوربەیان پێچکە گوێدرێژێکی وشك و بێ گۆشتیان لە بەرکی شەرواڵەکەیان ناوە، ناوە ناوە هێناویانەتە دەرێ و بە چەقۆ ڕنیویانە و ڕنراوەکەیان خواردووە)! .

**حەمەد ئاغیلە بێراوەیی:** (گرانی گەورە لەوەرزی پایز بۆ وەرزی بەهار بووە، مامم (خدر عەوێز دەیگێڕایەوە: بەچاوی خۆم بینیم لەمزگەوتی گەورەی گوندی بێراوەی خۆشناوەتی، پیاوێکی برسی ئێسکێکی پێ بوو، هیچ گۆشتی پێوە نەمابوو، ناوە ناوە بەددانەکانی قەپارێکی لێ دەدا و دەیکرۆشت و دەیخوارد)! .

خواردنی هێسك، دەکرێت بە هۆی سوێریەکەیەوە بووبێت .

**دڵدار جەلیزادە:** (خوشکە (عیرفەت) کە یەکێکە لە ئافرەتە تێکۆشەرەکانی کۆیە، لە زاری باپیریەوە دەڵێت: ئەم گرانی یە دەستی ئینگلیز و عوسمانی تیادابوو، کە بەم شێوەیە بیانەوێت گەلی کورد قڕو ئیبادە بکەن بە برسیەتی، لە برسانا گۆشتی یەکتری بخۆن!، کە دەگێڕێتەوە دەڵێت: لەو سەردەم پیاوێك دەبێت بەناوی (کەریم چاوسۆر)، دەباخچی دەبێت لە شاری کۆیە، لەم ڕۆژگارە ڕەشە ماڵێکی بینیوە، منداڵی خۆیان سەربڕیوە و گۆشتەکەی دەخۆن)! .

پیاوێکی گوندی بێتواتە بەناوی (مام سمایل) بە چاوی خۆی بینیویەتی! لە بێتواتە دایکێك منداڵە ساواکەی خۆی کوشتووە، گۆشتەکەی خواردوە و جەستە و دەستەکانی و دەوروبەری لە خوێنی منداڵەکەدا سورهەڵگەڕاون، مام سمایل کاتێك نارەزایی بەرامبەر ئەو کارە سامناکەی دایکەکە دەربڕیوە، دایکەکە گوتویەتی: ناچاربووم، ئەی چی بخۆم ؟! خەریك بوو لە برسان بمرم. هەروەها خێزانێکی تر کوڕێکی ساواو جوانکیلەیان هەبووە، دایك و باوکی لە برسان کوشتبوویان و گۆشتەکەیان خواردبوو! ئەو ڕوداوانە لە پەڕتوکی (خۆشناوەتی لە سەدەی بیستەم ـ بەرگی یەکەم) دا تۆمارکراون .

**عومەر ئەحمەد زێڵانی:** (خەڵکی گوندەکانی خۆشناوەتی،لە برسان گۆشتی منداڵیشیان خواردبوو) .

**نەجمەدین شێخ کەریم:** (بارودۆخەکە گەیشتە خواردنی گۆشتی منداڵی مردو ! تا لە مردن و برسیەتی ڕزگاریان بێت) .

**مەلا ڕسوڵ حەمەد وەرتی:** دایکم لەو سەردامەدا ژیابوو،ئەو ڕوداوەی بۆ گێڕامەوە: (ژنێکی پەناهەندە،منداڵێکی ساوای لە باوەش گرتبوو،بەرلەوەی بگاتە گوندەکەمان،گوندی وەرتێی ناوچەی باڵەکایەتی،دیاربوو برسیەتی تینی بۆ هێنابوو،لە برسان منداڵە ساواکەی خۆی خنکاند و لەبەر چاوی خەڵکی گوندەکەمان گۆشتەکەی خوارد،خەڵکی کە بەو شێوەیە بینیان هەموویان حەپەسان)! .

**ممدوح مزوری:** (بەلکە تەنگاوی گەیشبوو ئەو رادەیە گۆشتی مرۆڤیان ئەخوارد. پیاوێك ، کە ناوی عبداللە روستایی بو، .. گێڕایەوەو گوتی: ژنێك ناویشی هینا، بەلاّم لەیادم نەماوە لەگوندی (روست) زۆر برسی بوو برسیەتی زۆری لێی کرد تامندالێکی ساوای هەبو ، کە شەو داهات مندالّەکەی بردە دەرەوەی گوندو کوشتیەوەو گۆشتەکەی خوارد)! .

**ئی.جەی.ئارپ:** (باسی لەوە کردووە کە لە هەندێك حالّەتدا دانیشتوانەکەی لە برسان گۆشتی لاشەی مرۆڤی دەخوارد) .

لێرەدا مەبەست لە شاری ڕواندوز و دەوروبەریەتی .

**پەیسەر پرێس:** (پەنایان بردە بەر خواردنی گۆشتی مرۆڤ، کە کەمترین نرخی هەبوو.کاتێك ئاژەلّەکانی وەکو(پشیلە و سەگ)لە شەقام و کۆلاّنەکاندا نەمان،ژن و مێردێکی موسلّی بەناوەکانی(عەبود و خەجاوە)،پەنایان بۆ خواردنی گۆشتی مرۆڤ برد،یەکەمین قوربانی ئەوان پیرە ژنێکی دراوسێیان بوو،کاتێك خەریکی خواردنی ئەو پیرەژنە بوون،تامێکی ناخۆشی هەبوو،بۆیە خێرا بڕیاریاندا،کە گۆشتی منالّ بخۆن،ئەوان لە ڕێگای کوڕێکیانەوە،منالّیان دەهێنا بۆ مالّەوەی خۆیان و دەیانکوشت،دوای ماوەیەك ئەوان دەستیان بە فرۆشتنی گۆشت کرد، ئەوجار ئاشکرا بوون و بە تۆمەتی کوشتنی (١٠٠) مندالّ لە سێدارە دران. وە لە باسی ئەو خەلّکی شاری موسلّ دەلّێت: خوێنی ڕژاوی هەر ئاژەلّێکیان دەست کەوتبێت، لێی گەڕاون تاکو وشك بووەتەوە و دواتر خواردویانە) .

ئەو ڕوداوە، لە باسی سالّی (١٩١٦) یە .

**عەزیز یوسف شیەیی و حەسەن عبدولاّ شیەیی:** (لە کاتێ ئاژەڵ کوشتوەتەوەدا ،خەڵکی گوندی شیەی خۆشناوەتی، قاپێکیان لە بەرخوێنەکە ڕاگرتووە و خوێنەکەیان خواردووەتەوە) ! .

**ڕۆستەم ڕەسوڵ ئانگۆزی:** (گرانی گەورە کارەساتێکی لە بیرنەکراوە لەلای خەڵکی گوندی ئانگۆز بەتایبەتی و خەڵکی خۆشناوەتی بە گشتی،(ڕەسوڵ) ی باوکم دەیگێڕایەوە: خەڵك هێندە بێ خۆراك و برسی بوو،(یزدان) ی ئاژەڵ و پشیلەیان دەخواردن! (ئەسریشك و هیزە) یان لە نێو ئاودا خاوەکردنەوە و دەیانخواردن!، خەڵکی وا هەبوو ئەو خواردنانەشی دەست نەدەکەوتن، بەلاّم خاوەن ئاژەڵەکان گوزەرانیان باشتر بوو) .

**مەداود ابراهیم:** پیاوێکی قسەخۆشی لای خۆمان، کە ئێستا نەماوە، گێڕایەوە و وتی: (تەمەنم ٦ ـ ٧ ساڵان بوو، گرانیەك بوو پیاو پیاوی دەخوارد)! .

**حەسەن سەعید بەگ خەلیفەیی،** لە سەر زاری ئەو ژنە بەتەمەنەی کەناوی (سێوە) بووە و لە ڕۆژهەلاّتی کوردستانەوە بە دوای خواردندا گەڕاوە و خۆیی و دایك و باوکی هاتونەتە باشوری کوردستان،ئەو ڕوداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە: (کاتێك گەیشتینە نزیك گوندی خەلەکانی نزیك دوکان،باوکم زۆر هیلاك و برسی بوو لە گەڵ دایکم لە پێش مندا دەڕۆیشتن،کاتێك گەیشتمە لایان باوکم مردبوو،دایکم دەمی تێنابوو گۆشتەکەی دەخوارد! منیش نەمتوانی دان بە خۆمدا بگرم،برسیەتی تینی بۆ هێنابووم،دەمم بە خوێنی باوکم سورکرد و گۆشتەکەیم خوارد،من و دایکم هەر یەك لەلایەك کەوتبوینە سەر جەستەی

خۆشەویسترین و نزیکترین کەسمان،دەست و پەل و دەم و چاومان لە خوێندا سور بوو تاکو تێربووین گۆشتەکەمان خوارد،دواتر بەرە و شاری کۆیە و دەوروبەری بەرێ کەوتین،لاشەی بێ گۆشتی باوکم لەوێ بەجێما) .

بە تەمەنەکانی خۆشناوەتی لە زاری کەسانی لە خۆیان بە تەمەنتر، ڕوداوی لەو شێوەیان زۆر بۆ گێڕاوینەتەوە،لاشەی مردوان لە برسان لە دەشت و دەر کەوتبوون، سەگی بەڕەڵاو گورگ و دەعباکانی تر گۆشتیان دەخواردن، خەڵکیش ئەوەندە بێ هێز و لاواز بوون، لە توانایندانەبووە تەرمەکان بشارنەوە .

**زوبێر ڕەسول چۆمانی:** (بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی دەفەرەکە (باڵەکایەتی)، لەناوچوون و شایەتحاڵەکانی ئەو کات گێڕاویانەتەوە: کە مرۆڤ گۆشتی مرۆڤی مردوی خواردووە و ناوچەکە بۆ ماوەیەك ژمارەی دانیشتوانی بە شێوەیەك کەم بووە و کە بە نەمان حیسابەو دواتر خەڵك لە شوێنانی تر هاتوون و ناوچەکەیان ئاوەدان کردووەتەوە) .

**حوسێن حەمید خەتی و نوری بەکر خەتی:** پیاوێکی بەتەمەنی گوندی خەتێی خۆشناوەتی، بەناوی (حاجی گەورە) دەیگێڕایەوە: (زێرابی ئاودەستەکانی مزگەوتی خەتێ زۆر بەرز بوون،خۆم بینیم چەند پەناهەندەیەك لەنێو زێرابەکە،پیسایی مرۆڤیان بە پەلەدار دەکۆڵیەوە و دنکە نۆك و ...هیتر، دەردەهێناو دەیانخوارد) ! .

لێرەدا گومان لەوەدا نامێنێت، کە دانەوێڵە بە هیچ شێوەیەك دەست نەکەوتووە، ئەگەرنا مرۆڤ هانا بۆ بەر خواردنی پیسایی خۆی نابات ! .

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** (حکوومەت لە جیاتی پۆستاڵی عەسکەری، بەشی جوتێك کاڵە، زەوێڵە چەرمی دەدانێ، ئەوانیش لە جیاتی پێڵاو، بەناچاری دەیانکوڵاند و دەیانخوارد. ئەو گرانی و برسییەتییە گەیشتە ڕادەیەکی وا گەورەترین و قوڵترین دوژمنداری لە یادبکرێت، ئاغا پەترۆس کە دوای کوژرانی مارشیمون بووە سەرکردەی سەربازی ئاسوریەکان، لە (١٩) ی نیسانی (١٩١٨) بەیاننامەی ئاشتبوونەوەی دیان و موسڵمانەکانی دەرکرد. تیایدا نوسیبووی: براینە من کورتەیەکتان لە هەلومەرجی شنۆ بۆ ڕوندەکەمەوە، کە بە چاوی خۆم دیومە. لە کۆلاّن و ڕێگای نێو ماڵاّندا ئێسقان گۆشتی پێوە نەمابوو، پارچەکانی سکەلیت و هەیولایان هەڵنەوەشاوە و وەکو خۆی پێکەوە مابوو. خۆراکی سەگەکانی ئەوێ گۆشتی مرۆڤە.... چەند لە بەد بەدتر بینراوە، دایك گۆشتی ڕانی مناڵە خۆشەویستەکەی خۆی خواردووە، هەی هاوار براینە هاوارتان لێ دەکەم، لە پێناوی مرۆڤایەتی هەرچی زوتر ڕۆژگاری ئاشتبوونەوە تەواو بکەن بۆ ئەوەی ساڵی داهاتو پێویستیمان بە خواردنی گۆشتی نەوەی خۆمان نەبێ) .

## پەراوێز:

ئی.جەی.نار، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، لاپەڕە (٤٩) .

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان ـ چیرۆکە ناخ هەژێنەکانی، سەردەمی گرانییە گەورەکەی کوردستان)، گۆگڵ، ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١.

تاهیر احمد حەویزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم،لاپەڕەکانی(١٣٤ و ١٣٥ و ١٣٦).

حەسەن سەعید کەریم خەلیفەیی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/٤/١٤ لە کۆمەڵگای شکارتە.

حوسێن حەمید رسول خەتی چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/٩/٢٨ لە گوندی خەتێ.

حەسەن عبدولاّ حسن شێوەیی چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/١٤ لە گوندی شێوەی خوارو.

حەمەد ئاغیلە حەوێز بێراوەیی چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/٩/٢٦ لە گوندی بێراوە.

دڵدار جەلیزادە، (باسی گرانی گەورە لە زاری باپیریەوە)، ماڵپەڕی (شاری کۆیە)، لە (٢٦) ی ئۆکتۆبەر.

ڕۆستەم ڕەسوڵ ئەحمەد ئانگۆزی چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٧/٨/٦ لە گوندی ئانگۆز.

زوبێر رەسول چۆمانی، (گرانی گەورەو هۆلۆکۆستی ئێرانیەکان)، بەشی دووەم، فەیسبوک،لە لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

عومەر ئەحمەد خدر مەلەکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٥/١ لە کۆمەڵگای شکارتە.

عەزیز یوسف رسول شێوەیی چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/١٤ لە گوندی شێوەی خوارو.

عومەر ئەحمەد محمدامین زێخانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/١ لە گوندی زێخان.

مەلا ڕسوڵ حەمەد وەرتی چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٩/٩/٢٥ لە گوندی وەرتێ.

ممدوح مزوری، (مێژووی ڕواندز)، لاپەڕە (٢٨٨ ـ ٢٨٩).

م.داود ابراهیم، (گرانی گەورە)، فەیسبوک، لەلاپەڕەی تایبەتی خۆی، لە (٧) ی اکتوبری(٢٠١٨).

نەجمەدین شێخ کەریم، (شەڕی جیهانی یەکەم ١٩١٤ ـ ١٩١٨ ز)، گۆڤاری (k٢١)لاپەڕە (٦٧) فەیسبوك.

نوری بەکر عبدولا خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٨/٩/٢٠١٢ لە گوندی خەتێ.

نازەنین محمد وهبی، عەتا عەبدوللا معروف، دارا محمد عبدولا، (مێژووی نوێ و هاوچەرخ ـ بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی)، لاپەڕە (١١٥).

## هەشتەم: مردن بە هۆی برسیەتی و نەخۆشی و...

دەرهاویشتەکانی گرانی گەورە لە سەر خەڵکی کوردستان، نەخۆشی و مردنیشی بە دوای خۆیدا هێناوە.

**لازاریف. ن:** (لەماوەی ساڵەکانی شەڕ نزیکەی (٧٠) هەزار کورد لە کوردەکان ڕاگواسترانەوە. کە زیاتر لە نیوەی ئەو کوردانە لە ڕێگا مردن، بە هۆی برسیەتی و نەخۆشیەوە (پەتای کولێراو تیفۆئید و ژانەسك ...هتد) .

**نازەنین محمد وهبی و ئەوانی دیکە:** (گرانی گەورە ـ سەفەر بەلك، کە تیایدا زیاتر لە سەد هەزار کەس، هەر تەنها لە برسان مردن. لە کاتی ڕاگواستنی (٧٠٠٠٠٠) کورد لە زێدی خۆیان، شایەنی باسە ژمارەیەکی زۆر لە ڕێگادا لە بەر سەرماو سۆڵەی زستان و بێ خۆراکی و نەخۆشییەوە مردن) .

**نەجمەدین شێخ کەریم:** (لەم شەڕە کاولکاریەی جیهانیدا، ساڵی برسیەتی و نەهامەتی گەلی کوردی گرتەوە، کە زیاتر لە (١٥٠٠٠٠٠) یەك ملیۆن و نیو کورد، لە برسیەتی و ئاگری ئەم شەڕەدا تیاچوون. ئەم برسیەتیە گەورەیە لەناو گەلی کورد بە ساڵی (سەفەر بەلك) ناوبانگی دەرکرد. لە وێنەیەکدا کە ئینگلیزەکان لە ساڵی (١٩١٨) لە کەرکوك گرتویانە، باوکێکی کورد منداڵەکەی مردووە لە برسان، داویەتی بە کۆڵیداو بە تەنیا دەیباتە قەبرەستانی (شێخ محیەدین) لە گەڕەکی ئیسکان بۆ ناشتنی) .

**چاوی کورد:** (ساڵی (١٩١٨) گرانی و قات و قڕی ڕوو دەکاتە کوردستان و ناوچەکە.بە گرانیە گەورەکە ناوبانگی دەرکرد. لەو وێنەیەدا، منداڵێکی کورد لەو گرانیەدا لە برسان مردووە و بۆ گۆڕستانی دەبەن) .

جیاوازی یەکی زۆر بەدی دەکرێ لە نێوان ئەو سێ ژمارەیەی سەرەوە، تەنها بە هۆی بەڵگەنامە نوسراوەکانی ئەوکات ئەگەر هەبن، دەتوانین ژمارەی ڕاگوێزراوان و مردوان بە دەست بهێنین. وە سەبارەت بە وێنەکەش، کە لە سایتی (چاوی کورد) باسی کراوە، هەمان ئەو وێنەیەیە کە لە گۆڤاری (k٢١)، نەجمەدین شێخ کەریم خستویەتیە ڕوو، ئێمەش لە پاشکۆی وێنەکاندا دەیخەینە ڕوو.

**محمد رسوول هاوار:** (برسیەتی و قاتوقڕی ژمارەیەکی زۆری لەناو بردبوو، میللەتی کورد لە ناو وڵاتی عوسمانیدا، لە هەموو میللەتانی تر توشی زیان و ماڵ کاولی بوو. لە باسی دەرکردنی خەڵکی شارەکانی (دیاربەکر و موش و بەدلیس) دەڵێت: لە ڕێگادا بە هۆی برسیەتی و سەرماو نەخۆشییەوە، ژمارەیەکی زۆر کەمیان بە ساغی گەیشتنە ئەو شوێنانەی بۆیان دەستنیشان کرابوو. ئەوانەی لە ناو دۆڵ و لاپاڵی چیاکاندا دەکەوتن، کەس نەبوو فریایان بکەوێ و دەمردن. وە ئەوانەی لە زێدی خۆشیاندا مابوونەوە، بە هۆی نەخۆشی کولێرەو ئاوڵە و ڕشانەوە لە ناو چوون) .

**ئی.جەی.ئار:** (دانیشتوان بە ڕێژەی سەدا (٧٥) ی ژمارەی پێش جەنگ کەم بووبۆوە) .

لێرەدا مەبەستی لە سەرەتای گەیشتنی هێزی ئینگلیزە، لە ساڵی (١٩١٧) لە بەغداد بۆ باشوری کوردستان، ڕواندزو دەوروبەری .

**حوسێن حەمید خەتی و نوری بەکر خەتی:** (بەر لەوەی پەناهەندەکان ڕوو بکەنە گوندی خەتیی خۆشناوەتی،خەڵکیُ گوندەکە کێشەی برسیەتیان نەبووە، کاتێ ئەوان هاتبوون، برسیەتی بەرۆکی خەڵکی گوندەکەشی گرتبوو. بە تەمەنەکان دەیانگێڕایەوە: زووربەی بەیانیان ژمارەیەکی زۆر خەڵکی پەناهەندە، تەرمەکانیان لە نێو کۆڵان و بەردەرگاکان کەوتبوون، ئێمەش زۆر بێ هێز بووین، توانای ژێر گڵ کردنی مردوانمان نەما، بۆیە بە گەڵاَ و چیلکەدار داماندەپۆشین) .

**مەلا ئیبراهیم خەتی:** برسیەتیەکە لە گوندی خەتێ نەگەیشتبووە ئەو ڕادەیەی، کە خەڵك لە برسان بمرن، چونکە بەشی ئەوە ئاژەڵ و دانەوێڵەیان هەبووە، کە بتوانن لەو برسیەتی یە خۆیان قورتار بکەن، بەلاّم لە باکوری کوردستان و ناوچەی برادۆست، خەڵکێکی زۆر ڕوویان کردبووە گوندەکەمان و لە برسان مردبوون، پیاوێکی گوندەکەمان بەناوی (حاجی تۆفیق) دەیگێڕایەوە: (زۆربەی ڕۆژان، پێنج بۆ شەش کەسیان لە برسان دەمردن،ئێمەی خەڵکی گوند زۆر ماندوبووین لە ناشتنیان،بۆنی تەرمەکان لە ئاوایی گەڕابوو! سەگەکان تەرمەکانیان دەخواردن بۆیە ناچاربووین بیاننێژین،بەلاّم لە دوا ساتەکانی گرانیەکە،برسیەتی بەرۆکی

ئێمەشی گرت و چیتر توانای هەڵکەندنی گۆڕمان نەما، کەمێك گڵمان هەڵدەکەند و مردوەکانمان دەخستنە ناوو بە چیلکە دار داماندەپۆشین. چەند مردوێکمان لە باشوری گوند ،لە گۆڕستانی (ماوەتە) و (گردکەندی خانزادێ) ناشتن) .

**سایەی مەلا ئیبراهیم خەتێ:** (تەرمی خەڵکی پەناهەندە، لە گوندی خەتێ، هێندە زۆر بووە، خەڵکی گوندەکە فریای گۆڕهەڵکەندن نەکەوتوون، ئەو گۆڕانەی هەڵێشکەندراون و مردویان تیادا ناشتراوە، لە نیو مەتر قوڵتر نەبوون و لە هەر گۆڕێکدا چەند تەرمێکیان ناشتوون و گەڵاو چیلکەیان بەسەرداداون، دواتر بە خۆڵ دایان پۆشیون) .

گوندی خەتێ هاوسنورە لەگەڵ گوندەکانی ناوچەی هەروتی ، دەکرێت لە گوندەکانی ئەو ناوچەیەش هەمان کارەسات ڕویدابێت .

**محەمەد عەبدولا سەرسیانی:** (ئەو کات گوندی سەرسیانی بەری مەرگە، نزیکەی (٥٠) ماڵ بووە، برسیەتیەکە ماوەیەك بەردەوام بووە و هەموو ڕۆژێك لە خەڵکی پەناهەندە و خەڵکی گوندەکە، سێ بۆ چوار کەس لە برسان مردوون) .

**محمد ئەمین زەکی:** (زەرەری برسیەتی و نەخۆشی ئەتوانم بڵێم: کە موسیبەتی برسیەتی تەئسیری هەرە مودهیشی لە کوردستاندا بوو، وە لە بەحری ڕەشەوە تا عێراق، هەموو ولاَتانی شەرقی عوسمانی لە ژێر باڵی ئەم بەلاَیەدا مایەوە) . وە لەباسی دەرکردنی خەڵکی دیاربەکر و موش و بەدلیس، بۆ موسل و ئەتنە و حەلەب، نوسیویەتی: (لە وەقتی زستاندا زۆری لە برساناو سەرمانا مردو عەدەتا

هیچ منداڵێ دەرنەچووا وە حەتا کەوتبوونە حاڵێکی وا، کە لە کۆڵانی موسڵدا، لاشەی مردویان ئەخوارد. خولاسە ئەوی کە لە ئەوەل و دووەم ساڵی حەربدا بەسەر ئەرمەنیدا هات، لە دوای ساڵێك و دوو ساڵ، بە سەر کوردی مەزلومیشا هات)!.

**مستەفا عبدالقادر بالیسانی:** بەتەمەنەکانی گوندی بالیسانی خۆشناوەتی دەیانگێڕایەوە: (کە شەو دادەهات، لە کۆڵاناندا دەبووە نەڕە نەڕ و هاوار هاواری برسیەکان و بەردەبوونە گیانی یەکتری، بەیانیان کە دەرگاکانمان دەکردنەوە و دەچووینە دەرێ، دەمانبینی تەرمی (دە) کەس، بەڵکو زیاتریش لە بەر دەرگاکان کەوتبوون ! برسیەکان بە زۆری خەڵکی ناوچەی باڵەکایەتی بوون) .

**موخلیس ئیسماعیل بالیسانی:** (سەرەڕای گرانی و برسیەتی و نەبوونی خوێ، بڵاوبوونەوەی پەتا ناسراو بە (گەروخڕانە) ، هۆکارێکی تر بووە بۆ مردنی خەڵکی بالیسان و گوندەکانی دەوروبەری، وە زۆربەی ئەو کەسانەی کە مردبوون، بەهۆی بەد خۆراکی یەوە بووە، ئەو مردوانە لە چەند شوێنێکی گوندەکەدا ناشتراوون، کە ئێستاش شوێنەواریان هەرماوە وەکو: (سەروی ڕێگای چاکی زێخارێ و بناری گەڕەکی زەرتکان و قەبرە غەریب و زینۆك و زێلان)، لەبێ توانایی خەڵکەکە و زۆری ژمارەی مردوەکان بە نارێکی و بێ گوێدانە نەریتی ئاینی لەو شوێنانەدا نێژراوون) .

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** (ئەنجامی ئەو هەموو کردارە سەربازیانە، نەك بە تەنیا دەڤەرەکانی کوردستان وێران بوو، بەڵکو خەڵکەکەش قڕیان تێکەوت).

**دڵدار جەلیزادە:** (خوشکە (عیرفەت) کە یەکێکە لە ئافرەتە تێکۆشەرەکانی کۆیە، کە ئەو بنەماڵە گرانی گەورەیان دیوە و دەڵێ: لە ساڵی (١٩١٧ ـ ١٩١٨)، دەستی پێکردووە و بەردەوام بووە، لە پێش گرانیەکە باپیری لە ئەستەنبۆڵ دەبێت و هەواڵ بۆ داپیری و باپیری دێت، کە گرانی ڕوو لە کوردستان دەکات و خەڵك زۆر لە برسان دەمرن) .

**سەردار ئیسماعیل گردگۆزانی:** (ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی گوندی (گردگۆزان) ی خۆشناوەتی لە برسان مردبوون،لەسەرووی گوندەکە ژمارەیەك گۆڕی ئەو کات هەن پێیان دەڵێن: (گۆڕی ساڵانی گرانی) نزیکەی (١٢) گۆڕ دەبن) .

**عەزیز یوسف شێەیی و حەسەن عبدولا شێەیی:** (لە گوندی شێرەی خۆشناوەتی بە هۆی برسیەتییەوە چەند خێزانێك بەتەواوی کۆر بوونەتەوە بۆ نموونە ماڵی (وسو جەلال و ئەحمەدی گجیلە)، بێجگە لەوانە ماڵی (مستەفا) ی تەنها کوڕێکیان نەمردبوو بەناوی (خدر)، ئەوانی تر هەموویان مردبون) .

**ساڵح قەفتان:** (دانیشتوەکانیش لەبەر ئەوەی سوپای عوسمانی هەموو خواردەمەنیەکی لێ زەوت ئەکردن، گەلێکیان لە برسان مردن و گرانی و قات و قڕیش کەوتە ناو وڵاتەکەوە. وە لە باسی ڕاگواستنی کوردەکان لە باکوری کوردستان،لەلایەن عوسمانیەکانەوە،ئەو زۆر و ستەمە بێ پایانە بووە هۆی مردنی هەزاران کوردی بەدبەخت لە بەر برسیەتی و ماندوبون و سەرمای زستان لە ڕێگاوباندا) .

**حەمەد ئاغیلە بێراوەیی:** (مامم بەناوی (خدر عەوێز) دەیگێڕایەوە: ئەو خێزانانەی دانەوێڵە و ئاژەڵیان هەبوو، توانییان لەو قات و قڕیە دەربازبن. ئەوانەی هیچیشیان نەبوو لە برسان مردن. گۆڕەکانی گۆڕستانی (چاکی بەردەرکان) لە گوندی بێراوەی خۆشناوەتی ،بەشێکی زۆری مردوی ئەو کاتن، لەوانە هەندێکیان خەڵکی شوێنەکانی تربوون و هاتبوونە گوندەکەمان، ڕۆژی وابوو مردوەکان زۆربوون و لە تواناماندا نەبوو بیان بەینە گۆڕستانی دەرەوەی گوند بۆیە هەر لەو گۆڕستانە بەخاکمان دەسپاردن) .

**فازڵ هاودیانی:** (هەر ڕێگایەك لەو کورد ستانە قەبرێکی لێ بێ، هی کاتی گرانییە! خەڵك زۆر فەوتاوە) .

**عەنبەر حەمەد بێتواتی:** (خەڵکێکی زۆر لە گوندی بێتواتەی خۆشناوەتی لە برسان مردبوون، (مامە حەم) ی باوکم دەیگێڕایەوە: من و عالیاغا، ماڵ بە ماڵی بێتواتە دەگەڕاین، مردوەکانمان بە پشتێ هەڵدەگرتن و دەمانبردنە دامێن ئاوایی، ئەو شوێنەی پێی دەڵێن (بن نەماز) ، لەوێ لە نێو چەند ئەشکەوتۆرەیەك دامان دەنان و بەو جل و جۆڕانەی لە بەریان دابوون دامان دەپۆشین) .

هەتاکو ئێستاش ئەو ئەشکەوتۆرانە ، هێسك و پروسکی مرۆڤیان تیادا ماون.

**محەمەد عەزیز دواوەیی:** (ئەوەی من بیستوومە، سێزدە ماڵ لە گوندی (بێتواتە) ، ئاگریان کوژاوەتەوە، واتا هەموویان لە برسان مردوون، ئەو کەسانەی زۆر برسی بوون و هیچیان نەبووە بیخۆن، لە ڕووبار دەستنوێژیان هەڵگرتووە و

چوونەتە ئەشکەوتێك لە بەرامبەر بێتواتە، کە لەو کاتەوە پێی دەڵێن: (ئەشکەوتی سەرکان)، لەوێ ڕاکشاون هەتاکوو گیانیان دەرچووە) .

بە پێی چەند گێڕانەوەیەکی تر،لە پەڕتوکی (خۆشناوەتی لە سەدەی بیستەمدا ـ بەرگی یەکەم)، نەك تەنها سێزدە ماڵ، بەڵك و هەشتا ماڵ لە بێتواتە ئاگریان کوژاوەتەوە .

**عەبدوڵا حەمەدەمین سەریکانی:** (خەڵکی بێتواتە لە برسان، بەلاکە لاك گەیشتونەتە ئەشکەوتی سەرکان، لەوێ ڕاکشاون هەتاکو گیانیان دەرچووە. بە چاوی خۆم بینیومە، ئەوکاتەی شوان بووم لە ساڵانی (١٩٦٠) دەچوومە نزیك ئەشکەوتەکە، ئێسك و پرۆسکی مردوان لە نێو ئەشکەوتەکەدا هێندە زۆر بوون هەتاکو بەری ئەشکەوتەکە!، بزنەکانم دەچوونە زارکی ئەشکەوتەکە و ئێسکەکانیان دەلستنەوە، بەو شێوەیە ئێسکەکان لە نێو ئەشکەوتەکەدا مابوون، کاتێك حکومەتی عێراق بۆردومانی ئەو ناوچەیەی کرد، لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول، چەند کەسێکی خەڵکی بێتواتە ئێسکەکانیان فڕێدانە دەرێ و لە ترسی بۆردومانەکە ماڵیان هێنایە ناو ئەشکەوتەکە) .

بە مەبەستی لە نزیکەوە بینینی ئەشکەوتی سەرکان، لە ڕۆژی ( ١٣/١/ ٢٠١٨) لە کاتی بەیانی، لە گوندی (دواوێ) وە چوومە ئەشکەوتەکە، بەرزی زارکی ئەشەوتەکە مەترونیوێك و بەرینیەکەی مەترێك زیاترە، لە دیوی ناوەوەی چوار مەتر بەرین و پێنج مەتر درێژ و بەرزیەکەی دوومەتر دەبێت و کون و

قوژبنی زۆرە ، ئەشکەوتێکی بچوکی تریشی لە پاڵە و بەربەستی نێوانیان نزیکەی دوو مەتر دەبێت و لە نێو بەربەستەکەدا کونێك هەیە کە مرۆڤ دەتوانێت بە هۆیەوە لە سەر زگ بچێتە ئەشکەوتەکەی تر، لە نێو کون و قوژبنی ئەشکەوتە گەورەکەدا ژمارەیەکی زۆر ئێسکی مرۆڤ هەن، کە هەندێکیان وەك خۆیان ماونەتەوە، هەر کە چاوم بە دیوی ناوەوەی ئەشکەوتەکە و ئەو هەموو ئێسك و خۆڵەمێشە کەوت، دیمەنی ئەو کاتی تەرمی مردوەکانم هاتە بەرچاوو تاسام! هیچ گومانێکم لە ڕاستی ئەو ڕووداوە مەرگە ساتە نەما، (بەختیار محەمەدەمین ـ نوسەر).

**پەیسەر پریس:** (ئەوانەی ئەو ڕۆژگارانەیان بە چاوی خۆیان بینیووە و بۆ مێژوو نوسانیان گێڕاوەتەوە،یان لە یاداشتەکانیان تۆماریان کردووە،دەڵێت: مردن ببووە شتێکی ئاسایی و لە سەر شۆستە و شەقامەکاندا ڕۆژانە دەبینران و کەس لێی نەدەپرسینەوە،تەنها کارمەندانی شارەوانیەکان،بەیانیان و ئێواران،کۆیان دەکردنەوە و دەیاننێشتن.لە سەردەمی ئەو گرانیەدا کە چوار ساڵ زیاتری خایەند،بە هەزاران خەڵك لە برسان مردن،بەلاّم ئەوەی جێگای سەرنجی مێژوونوسانە،ئەوەیە کاریگەری گرانیەکە،ئەوەندەی لە سەر شارەکان کاریگەری هەبوو،ئەوەندە کاریگەری لە سەر گوندەکان دانەنا،بەتایبەت دوورە دەستەکان) .

**خالید حەمەدەمین هەرمکی و خالید یوسف هەرمکی:** (تورك هۆکاری بلاّوبوونەوەی گرانی و قات و قڕی بوون لە خۆشناوەتی،ئەو کات بەشێکی زۆری خەڵکی گوندی هەرمك لەبرسان مردبوون) .

**عەبدوڵلا قادر بێناتانی:** (لەسەردەمی قڕانیّ (گرانی گەورە) ،خەڵكی گوندی بێناتانی خۆشناوەتی، زۆربەی هەرە زۆریان، لە برسان مردبوون) .

**م.محمدحسن سەرگەینێلی:** (بێگومان شەڕی ڕوس و ئێران جگە لە كوشتار و كوشتن،چەندان كارەساتی تری كوشندەی بەدوای خۆیدا هێنا،لەوانە: ئاوارەبوون،بڵاوبوونەوەی گرانی و قاتی و برسیەتیەكی كوشندە،كە خەڵكی لە هەموو ڕێگاوبانەكاندا مردوون. برسیەتی لە عێراقدا بڵاوبۆوە، ساڵی (١٩١٧ـ١٩١٨) لە موسڵدا (١٠) هەزار كەس لە برسان مردن، دەیان هەزار بە هۆی تاعوون و پەتاكانەوە بوونە قوربانی، لە كۆتایی شەڕدا وڵات بەتەواوی چۆڵ بوو.لە گوندان تا لە پشدەر، لەناودەشت، لە خۆشناوەتی، لە بناری قەندیل، كاتیّ لە خەو هەڵساون، خەڵكێكی زۆر لەبن سوانەو بن دیوار و سەر ڕێگاكان مردوون، پیرەمێردەكانی خۆشناوەتی و بناری قەندیل، زۆر لەو ڕوداوانەیان بۆ گێڕامەوە، كە پێی دەڵێن (گرانی گەورە)، كە لە ساڵی (١٩١٦) دا ڕوودەدات. خەڵكی ناوچەكە، وایان لیّ هاتبوو، ئەوانیش ترسی ئاوارە بوونیان بۆ دروست ببێت، هەموو شەوێك (١٠ ـ ١٥) كەس لە بن سوانە و كۆڵانەكاندا لە برسان دەمردن و لە گۆڕستان بە خاكیان سپاردون) .

**ئیبراهیم ئیبراهیم میاوەلی:** (خەڵكی ناوچەی پشدەریش، بە هۆی هاتنی ئەم ئاوارانەوە، ئەوانیش توشی ئەو ڕۆژە ڕەشە بوون) .

**ڕەفیق حەمەد چیوەیی و ئەنوەر عەزیز چیوەیی و سابیر حوسێن چیوەیی:** (لە گوندی چیوەی خۆشناوەتی خەڵکێکی زۆر لەبرسان مردبوون، هەموو ساڵێك کە وەرزی بەهار هاتووە، خەڵکی گوندەکە چوونەتە شاخەکان و بە خواردنی کەنگر خۆیان تێر کردووە، هەندێکیشیان هەر لەوێ مردون و کەس لەتوانایدا نەبووە ژێرگڵیان بکات) .

**ممدوح مزووری:** (خەڵکی رواندز ئەڵێ: قاتییێکی زۆر حێل بوو، خەڵك لە کولانان و لە رێوباران، لەبرسان بەرئەبونەوەو ئەمردن، هەرجێیەکی بچوبای مردوێك دوو مردوی لێبوو، ئەنجا کولانبا پێشدەرکەبا یا گوفەك با. وای لێهاتبوو مردو ئەوەندە زۆر بوو بوو کەس نەبوو بیان شارێتەوە، چونکە خەڵکەکە هەمووی برسی بوو توانایان نەبوو بیان شارنەوە. تا ئەم رادەیە ماڵی واهەبوو کەسیان نەمابوو هەر کوژببووە) .

**محەمەد عەزیز دواوەیی:** (لە گوندی (ئاندێك) ی خۆشناوەتیش، چەند ماڵێك ئاگریان کوژاوەتەوە، ژنێك کاتێ هەموو کەس و کاری مردبوون، بە هاوار هاوار و لە خۆدان چووەتە بەرامبەری گوندی بێتواتە، هاواری بۆ بەر خەڵکی بێتواتە بردبوو بانگی کردبوون، پیاوێکی بێتواتە بە هانایەوە چوو بوو، بردبوویەوە ماڵی خۆی و خواردنی دابۆیێ و دواتر کردبوویە هاوسەری خۆی) .

**محمد ئەمین زەکی:** (برسیەتی و شپرزەیی خەڵق بە تەبیعەت لە ئۆردو زیاتر بوو.ئەوانەی کە زستانی عەینی (١٣٣٣ و ١٣٣٤) یان لە موسلدا ڕابواردبێ،

ئەڵبەتە دیویانە وە یا بیستویانە کە موهاجیرینی کورد لە کۆڵانانا لە سەرمانا و لە برسانا چۆن مردون،ئەم فەجایعە هەر موخەسەس بە موسڵ نەبوو،لە وڵاتی ئەتنە و حەلەبیشدا جاری بوو.لە شاری سلێمانیدا وە لە عەینی ساڵدا، برسیەتی گەیشتە نیهایەت،زۆر مومکینە زەرەری ڕۆحی،نزیکەی نیو ملیۆن ببێ) .

لێرەدا مەبەستی لە هەموو کوردستانە.

**سیسیل جۆن ئیدمۆندس:** (گوشار و چەوساندنەوەی تورکان لە ڕادە تێپەڕیبوو، برسیەتی ژمارەیەك خەڵك و ئاژەڵی قڕکردبوو. ساڵی ١٩١٨ کاتێك نوێڵ هاتە سلێمانی هێشتا تەرمی خەڵك لەناو کۆڵان و خانوە وێران بووەکاندا دەبینراو دیبویان خەڵك لە برسان یەکتریان خواردبوو، شار چۆڵکرابوو کەمتر لە یەك لە سێی دانیشتوانی شار مابوونەوە. هەر بەم جۆرەش مەزندە دەکرا، دوو لە سێی خەڵکی گوندەکانیش مردبن یان ئاوارە بوو بن. چوارتا بۆ ناوەندی قەزا جێیەکی زۆر باش بوو، لەناوەندی قەزا هەڵکەوتبوو، هەرچەندە بە هۆی گوشاری برسیەتی ئەو دواییانە نفوسی هاتبوە سەر بیست بنەماڵە، بەلاّم بەر لە جەنگ سەد بنەماڵەی لێ دەژیا، لە بەر ئەوە جێی پەرەستاندن بوو) .

**ڕۆستەم ڕەسوڵ ئانگۆزی:** (گرانی گەورە لە بیرەوەری کەسانی بە تەمەن، کارەساتێکی لە بیرنەکراوبوو، (ڕەسوڵ) ی باوکم دەیگێڕایەوە: خەڵکی گوندی ئانگۆزی خۆشناوەتی و دەوروبەری،هێندە برسی بوون وەك توان هەڵدەوەران،(حاجی خدر و خێزانەکەی) تەرمی مردوەکانیان لە ناو ئاوایی

هەڵدەگرتن و دەیانبردنە ڕۆژئاوای گوندەکە نزیك گۆڕستانی شێخ پیریس،لەوێ چاڵێکیان هەڵدەکەند و تەرمەکانیان هەڵدەدانە ناوێ و کەمێك خۆڵیان بەسەردا دەکردن بێجگە لەوە بەدەیان تەرم لە دەوروبەری ئاوایی کەوتبوون و قەل و دارەش و سە و پشیلە گۆشتەکەیان دەخواردن) .

**دابلیو.ئارهێی:** (لە کاتی شەڕە گەورەکەدا (هەولێر) ڕۆژێك لە ڕۆژان مەیدانی شەڕ نەبووە، ڕوسەکان گەیشتنە ڕواندوز ئینگلیزەکانیش گەیشتنە ئاڵتون کۆپری و دەوروبەری موسڵ، بەلاّم هەر وامایەوە بێ ئەوەی کەسێك دەستی بۆ ببا خەڵکەکەی توانیان ئەمباری گەنم بشارنەوە لەبەرئەوە خەڵکەکەی لە کاتی گرانیە گەورەکەدا زۆر نەفەوتان کەمێکیان نەبێ. وە لە باسی شاری(کۆیە) دەڵێت: کە شەڕ کۆتایی هات دانیشتوانی شار لە (١٠٠٠٠) کەسەوە ببوونە (٤٠٠٠) کەس، ئەمەو نیوەی ماڵەکانی شار چۆڵ و هۆڵ و ڕوخاون،خەڵکەکەشی لە هەژاریەکی بێ وێنەدا بوون. ئەگەر حکومەتی بەریتانیا ناردنی نوێنەری خۆی مانگێك دواخستایە ئەوا خەڵکەکەی ڕەویان دەکرد و چۆڵیان دەکرد و دەبووە کەلاوە و سەدان کەسیش لە برسان دەمردن) .

لێرەدا روون نەکراوەتەوە، ئاخۆ دە هەزار کەسەکەی شاری کۆیە، کە کەمی کردووە بۆ چوار هەزار کەس، مردوون یان ئاوارە بوون .

**تاهیر احمد حەوێزی،** لەباسی شاری کۆیەدا: (سەرقەبرۆکان زۆر کۆنە، مردوی لات و بێ کەس و ناچاری زۆر کەمی لێ نێژراوە، وە هەندێکیشیان بردیتە گردی (شێخ مستەفا) ی، بەتایبەتی لە سەفەربەلك و گرانی زۆر مردویان لە عاردی

باخچەکانی ئەو ناوە ناشتووە،کە لە قۆرتەکەیان ناوە،هەتا هاتونەوە سەری سەگ هەندێکی دەرهێناون.کابرایەکی ئیختیار لەو سالآنە دەیگوت: تفەنگە ڕەشکەیەکم هەبوو،زۆر گورگ و سەگم لە سەر کەلاکی،ئینسانی مردو کوشتووە.عەشایرەکی زۆر بە برسیەتی ڕویان لەشاری کردبوو،بەتایبەتی (سوێسنی) یەکان، لەبازاڕو لە کوچەو کۆلآنەکان دەکەوتن،ئافرەتێك منداڵەکەی مەمکی دەمژی و خۆشی مردبوو،پیاو نەمابوون بیانشارنەوە،دوو سێ سێیان،لە قەد کەندی گۆمەکانی شاری و لە کاولەکان دەشاردنەوە،هەر بایی ئەوەندەی دەعبا دەریان نەینی،بەشەر زۆر بێ قیمەت بوو بوو،زۆر کۆیی،دەرگای لەسەرخۆی داخست و بە خۆیی و منداڵیەوە،لە ژورێ لەبرسان مردن. ڕۆژێ نزیکەی (١٠ـ١٥) کەس دەمردن، وە لە کۆلآنەو بن دەرگاکان دەکەوتن،هەبوو باران و ئاوی پلوسکێی لێ دەدا.لە دەشتێ پێڕانەدەگەیشتن قەبری هەڵبکەنن، سێ جار مەیتیان دەخستە ناو چاڵە دەغلی و بە گلێ و خۆڵ پڕیان دەکردەوە. وە لەباسی شاری کۆیەدا: لە گوندان لەبن دیواران دەکەوتن و دەمردن) .

**هاوکار عبدالله شێخ وەسانی:** (مەلای گەورە، هەر لە بارەی گرانی و برسیەتی شاری کۆیە دەنوسێت: قەحت و غلامان دیت، فوقەڕا بە کۆمەڵ ئەمردن، بەسەر یەکا ئەڕمان، مەئمورەکانی (فاسق) و (فاجیر)، دونبەڵەکیان لێ ئەداو ڕەقس و سەمایان ئەکرد، پیاوێ بوو وەستا (مەعروفی ئەحمە حەپە) ی، خوا عەفوی کا، لە گەڵ عائیلەی ئەوەی هەبوو خواردیان، خەلآس بوو، برسیەتی تەئسیری تێ کردن، پیاوێ بە غیرەت و بە ناموس بوو، نەیتوانی خۆی و عائیلەی سواڵ بکەن، یا دەخیلی

کەسێ ببێ، دەرکەیان لە سەر خۆ کلیلدا، چوونە ناوجێ نوستن، هەموویان تێکڕا مردن، بە بێنێ زاندرا کە مردینە، دفن کران، (مع الاسف)، ئەو نەوعە مەردە غەبوورە، ناویشی گوم ئەبێ) .

لێرەدا (مەلای گەورەی کۆیە)، ئاخ بۆ پیاوی بە عیزەت و مەرد هەڵدەکێشێ، پێدەچێ مەلای گەورە، یان خۆشی بارو گوزەرانی باش نەبووە، یان ئاگاداری بارو گوزەرانی ئەو خێزانە نەبووە، ئەگەرنا چۆن هاوکاری نەدەکرد؟ هەرچەندە دەنگۆی ئەوە هەیە، کە ئەویش هاوکاری هەژارانی کردبێ، ئەگەر وابێ دیارە ئاگاداری بارو گوزەرانی خێزانەکە نەبووە.

**ڕەفیق حلمی:** (ڕۆژ نەبوو کە شارێکی وەکو سلێمانی،لەبرسا وەیا لەبەر نەخۆشی،کە ئەویش هەر لە ڕووی برسیەتییەوە بوو،لە دە کەس کەمتری لێ بمرێت،ئەم ژمارەیە بەلای کەمەوەیە،ئەگینا،گەلێ ڕۆژی وائەبوو کە زیاتریشی لێ بمرێ،ئیتر شاردنەوەی نەرمەی مردووەکان،لە توانای بەلەدیەدا نەما! بەتایبەتی دوای ئەوە کە لەبەرزۆری تێپەڕبوونی نەرمە(لاشە)ی مردوو،بە کۆلانەکاندا زراوو زندەقی زیندوەکان چوو،ئینجا کاتی بەلادا نەچوون و نەشاردنەوەی نەرمەی مردوەکان دەستی پێ کرد،ئیتر پیاوم ئەویست کە ڕوو بکاتە مزگەوتە ڕوخاوێك،بە چەپەرو لاکۆلانێکدا تێپەڕێت،وەیا سەربکا بە کەلاوەیەکا،وەیا چاو بە ژوورێکی چۆڵ و تاریك و بۆگەنا بگێڕێت،بێگومان لە هەموو هەنگاوێکدا،نەرمەیەکی ڕوتوقوت و ئاوساوو شین هەڵگەڕاوی بەرچاو ئەکەوت،کە بنیادەمی ئەترساند و ئەیسڵەماندەوە،چاونوقاندن و ڕاکردن لەو دیمەنە خەفەت پڕێنەرانە کەڵکی

نەئەگرت بە خۆشاردنەوە و دورکەوتنەوەرزگاری لەم وێنە پڕ لە عیبرەتانا،کە کزەی لە جەرگ ئەهێناو دڵی هەڵئەقرچاند،چنگ نەئەکەوت).

**شادمان مەلا حەسەن:** (ناوچەی سلێمانی لە سەدا حەفتای دانیشتوانەکەی بە سەربازەوە مردن،مێجەر سۆن دەڵێ: شاری سلێمانی بەر لە جەنگ ژمارەی دانیشتوانی بیست هەزار کەس بوو،کەچی دوای جەنگ تەنها دوو هەزار و پێنج سەد کەس مابۆوە) .

**جەمال بابان:** (لەبرسا مردن گەیشتە ڕادەیەك،کەس نەبوو لاشەی مردووی سەر شەقامەکان بشارێتەوە.لە ئەنجامی ئەو ڕۆژگارە ناهەمووارەی(شەڕی گەورەی یەکەم)،یاخۆ وەك لای خۆمان پێی دەڵێن: (سەفەربەر ـ سەفەربەلك) بەتورکی، ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی لە (٤٠٠٠٠) چل هەزار کەسەوە، هاتە سەر تەنها (٩٠٠٠) نۆ هەزار کەس) .

**ئەحمەد حسێن هەرتەلی**، وەك دەگێڕنەوە: (خەڵکێکی زۆری پەناهەندە،لە گوندی هەرتەلی خۆشناوەتی،لەسەر گۆڕستانی (مەلا سمایل)، لە نزیك گوند،لە برسان مردون، تەرمەکانیان لە سەریەك کەڵەکە بوون، وە ژمارەیەکی زۆر کسۆکی برسی گۆشتەکەیان خواردون و بەو هۆیەوە هار بوون).

دەکرێت بەر لەوەی بمرن، خۆیان چووبنە سەر گۆڕستانەکە و لەوێ مردبن؟ یان لە نێو گوندەکە مردون و خەڵکی گوند ئەوانەی باروگوزەرانیان باش بووە،بۆ ئەوەی گوندەکە بۆن نەبێت،بردونیانە ئەو شوێنە و لەوێ دایان ناون.(نوسەران)

**سەعید عەبدولا هەرتەلی:** (ئەو خەڵکەی لە گوندی هەرتەل لەبرسان مردبوون،هەندێکیان پەناهەندە بوون، ئەوانەی تریش خەڵکی گوندەکە بوون و تەرمەکانیان لە کۆڵان و مزگەوت کەوتون،بەشێك لە خەڵکی گوندەکە کە لە گرانیەکە دەربازبوون،ئەوانە بوون کە تورکان دەستیان بە ئاژەڵ و خۆراکیان نەگەیشتبوو،یان بەشێك لە خۆراکەکەیان بە توندی حەشاردابووە،کە گرانیەکە کۆتایی هاتبوو ئەو خەڵکەی لە ژیاندا مابوون ئێسك و پروسکی مردوەکانیان ناشتوون،تا ماوەیەك بۆنی تەرمی مردوەکان لە گوندەکە هەر ماوە) .

بەرەبابێك بەناوی (بەدرانان)، لە برسان هەموویان مردبوون، تەنها ژنێکیان نەبێت، کە تاکو ئەو ساڵانەی پێشوو لە ژیاندا مابوو.

**شادمان مەلا حەسەن:** (ساڵی (١٩١٧)، ساڵی گەرمەی گرانی و قات و قڕی و نەهامەتی بوو بۆ خەڵکی کوردستان، سەفەربەلکی گەورە لەو ساڵەدا بووە. جگە لەناوچوونی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان، گوندی (نەیری) لە دوو سەدو پەنجا ماڵ تەنها حەوت ماڵی مایەوە، عەشیرەتی برادۆست لە هەزارو هەشت سەد خێزان تەنها سەدو پەنجاو حەوت خێزان مایەوە، عەشیرەتی کۆرك لە سەدو پەنجا خێزان تەنها پێنج خێزان مایەوە، لە ئەنجامی ئەو شەڕە ماڵوێرانیکەرە هێزی مرۆیی و ئابوری کوردستان بەلایەنی کەمەوە لە سەدا شەست تا حەفتا لەناو چوو، لە خوت و خۆڕایی بۆیە کورد بەبێ ئەوەی دەستی هەبووبێ یان قازانجی هەبووبێ دووچاری جەنگێکی سوتێنەر بوو زیانێکی ئەوتۆی بەرکەوت، لە هیچ دۆخێك وای بەسەر نەهاتووە) .

**زوبێر رەسول چۆمانی:** (لە گرانی گەورەدا لە ساڵی (١٩١٤ ـ ١٩٢٠)، بەشێکی زۆر لە خەڵکی باڵەکایەتی مردن و زۆرێك لە گوندەکان بە چۆڵی مانەوە).

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** (سەربازە تورکەکان لە شەوانی سەخت و ئەنگوستەچاوی زستان، لە دەرگای کوردە هەژارەکانیان دەدا: (هجی الله اشکنه اجم، بیر پارچە اکمك وێر از هورماهجی). بۆ خاتری خوا برسیمە، لەتێك نان و هەندێك خورمام بدەنێ. وەك ئەحمەد خواجە لە بیرەوەریە مێژوویەکەی دەگێڕێتەوە: سەربازەکانی تورك برسی، تینو، بێ بەرگ، بێ پێڵاو، زۆریان بە تفەنگی بێ فیشەکەوە رەق دەبوونەوە و دەمردن).

**دکتۆر ئیسماعیل شوکر رەسول:** (چوار ساڵەکەی دوایی حوکمی عوسمانی، هاوکات بوو لە گەڵ چەندین گۆڕانکاری گەورە، کە ئاکامی خراپی هەبوو لە سەر خەڵکی ناوچەکە، برسیەتی و هەژاری و نیگەرانی، توشی خەڵکی هەولێر بوو....).

گرانی گەورە لە ساڵی (١٩١٨)، کۆتایی هاتووە،بەلاّم دەکرێ لە هەندێك ناوچەدا هەتاکو چەند ساڵێك کاریگەری مابێت.

**ئیبراهیم ئیبراهیم میاوەدلی:** (یەکێك لەوانەی کە ئەو رووداوە دڵتەزێنەمان بۆ دەگێڕێتەوە، دایکمە کە تەمەنی (١١٦) ساڵە و دەڵێت: ئەو کاتە من گەورە بووم و ماڵمان لە گوندی گەرمکان بووە، هەرکاتێك ئەو قسانەو ئەو رِوداوانەمان بۆ دەگێڕێتەوە، دەست دەکات بە گریان و دەڵێت: وەك فیلم دێتەوە بەرچاوم.

دەڵێت: بەیانیان کە خەڵکی گەرمکان لە خەو هەڵدەستان، دە تا دوازدە کەس لە ژن و منداڵ و پیاوو گەنج و پیر، لە کۆڵان و بن گوێ سوانان دەمردن، بەتایبەتی بە زۆری لەو ئەشکەوتانەی کە لە ئەو بەر ئەو بەری گوندی گەرمکاندان، ئینجا خەڵکەکە کۆیان دەکردنەوە و گردێك لە خوارووی گەرمکانەوە هەیەو بە سەر (زێ)دا دەڕوانێت، لەم گردە هەندێك ئەرزیان بۆ هەڵدەکەند و لە ناو چاڵەکەیان دەناو گەڵای دار بەڕویان لە سەر جەنازەکەی دادەناو گڵیان بە سەردا دەدا، ئەم گۆڕستانە ئێستا بە (گۆڕستانی کێلە شینە) بەناو بانگە، هەر ئەو ساڵە قەبرەستانێکی گەورەی لێ دروست بوو.

ئەو خەڵکانەی برسی بوونە و هاتوونەتە (خۆشناوەتی و بیتوێن و هەولێر و دەوروبەری)، و لە مردن ڕزگاریان بووە، هەندێکیان نەگەڕاونەتەوە زێدی خۆیان، وە لە گەڵ خەڵکی ئەو ناوچانە هاوسەرگیرییان کردووە و وەچەیان ناوەتەوە. وە بە پێچەوانەشەوە، ئەوانەی لەو ناوچانەش، ئاوارەی شوێنەکانی تر بوون، دەکرێت بەشێکیان لە برسان نەمردبن و هاوسەرگیریان لە گەڵ خەڵکی ناوچەکانی تر کردبێت و وەچەیان نابێتەوە.

بە هۆیەوە برسیەتی یەوە مرۆڤ پەنا بۆ بەر خواردنی شتی پیس و نەگونجاو دەبا. **ڕەفیق حیلمی**: (دیارە کە ئەم حاڵە بوو بە هۆی داهاتنی گەلێك جۆرە نەخۆشی، لەکاتێکدا کە خواردەمەنی، بەڵکوو هەتا نانی وشك و پاقلەی کولاویش بوو بوو بە دەرمان و تەنها خواپێداوەکان، ئەویش بە دەگمەن دەستیان ئەکەوت، دەرمان

دەستیش بکەوتایە، لەوانە نەبوو بێتەوە بە بیرا کە بتوانیّ بیکرِێت . لەبەر ئەوە هەموو نەخۆشیەك نامزەدی مردن بوو، خۆزگە زووش ئەمردن، پێش ئەوەی بین بە مەینەتی دونیا، لەبەرچاو پاك ئەبوونەوە، بەلاّم ئەم نەخۆشانە کە بەشی زۆربەیان، هیچ دەردێکیان نەبوو! لەرِووی خواردنی خراپ و نەرمەی تۆپیوی هەندیّ باڵندەو مریشك و کەڵەشێر وە یا لەبەر خواردنی ئاردەبەرِوو، یاتۆوی وشك و پەمودانە، پێش مردنیان بە ماوەیەکی تەواو، رِەق و وشك ئەبوونەوە، ئینجا دەموچاو و دەست و پێیان دەئاوسا، وە قژی سەر و رِیش و سمێڵی چڵکن و ئاڵۆزاوی بەیەکا چوویان بەرِووی ئاوساو و چاوی بە قولاّچویانە ئەهاتە خوارەوە) .

**پەیسەر پرِێس:** (بەهۆی کوشتاری زۆری سەرەتای جەنگ و ئاوارەبوونی بەشێکی زۆری کوردەکانی باکووری رِۆژهەلاّتی کوردستان، بۆ باشووری کوردستان و سنووری ویلایەتی موسڵ، هەزاران کەس لە برساندا مردن، بە هۆی کەمبوونەوەی بەرگری و بلاّوبوونەوەی ڤایرۆسەوە نەخۆشییەکانی (کولێرا، تاعون و گرانەتا) بە شێوەیەکی بەربلاّو) .

**خالید حوسێن:** (ئەو ساڵانە بە ساڵانی سەفەربەلك و گرانییەکە و بلاّوبوونەوەی تاعوون ناسراوە، کە خەڵکێکی زۆر بوونەتە قوربانی دەستی تاعوون و مردوون لە برسیەتی و هەژاریدا) .

**جەلیلی جەلیل و ئەوانی دیکە:** (هاوکات هەندیّ عەشیرەت بە تەواوی لە ناوچوون بە هۆی بلاّوبوونەوەی پەتای کولێراو گرانەتاو نەخۆشییەکانی

هەناو،هەروەها کەمبوونەوەی ئالیك و بلاوبوونەوەی نەخۆشی لە نێو ئاژەلاندا،زیانێکی زۆری بە مالات گەیاند،کە تاکە سەرچاوەی ژیانی کورد بوو).

سەبارەت بە لەناوچوونی چەند عەشیرەتێك، لە چەندین کەسی بەتەمەن بیستوومانە، کاتێ باسی کۆربوونەوەی بەرەباب و چەند بنەمالەیەکیان دەکرد .

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** بەم چەشنە لە دوا سالی جەنگدا لە کوردستان، برسیەتی گەیشتبووە رادەیەکی وا وەك رەفیق حیلمی دەلێت: (ئیتر ئەوانەی خوا پاروەنانێکیشی دابوونێ و بە کولەمەرگی دەژیان، لەبەر هاوار و نوزەی بێهێز و دەنگی پارانەوەی ژن و منال و پیرەمێردە نەخۆشەکانی دەست و پێ ئاوساو بە دەست خۆیان نەبوو لە قولپەی گریانیان دەدا) .

## پەراوێز:

ئی.جەی.ئار، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، لاپەڕە (٤٩).

ئیبراهیم ئیبراهیم میراودەلی، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی میراودەلی پشدەر)، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٣٧).

ئەنوەر عەزیز محمد چیوەیی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٦/٨ لە گوندی چیوەی خوارو.

ئەحمەد حسێن ئەحمد هەرتەلی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٩/٦/١٥ لە گوندی هەرتەل.

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان ـ چیرۆکە ناخ هەژێنەکانی سەردەمی گرانییە گەورەکەی کوردستان) گوگڵ، لە ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١.

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم،لاپەڕەکانی(٣٠ و ١٣١ و ١٣٢ و ١٣٣ و ١٣٤ و ١٣٦).

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەم) بەرگی یەکەم و دووەم،لاپەڕە (٥٢ و ٥٣).

حوسێن حەمید رسول خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/٩/٢٨ لە گوندی خەتێ.

حەسەن عبدولا حسن شیەیی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/١٤ لە گوندی شیەی خوارو.

حەمەد ئاغیلە حەوێز بێراوەیی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٢٦ لە گوندی بێراوە.

خالید حەمەدەمین مستەفا هەرمکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٦/١٥ لە گوندی مێرگەسەر.

خالید یوسف حسن هەرمکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٦/١٥ لە گوندی هەرمك.

دکتۆر ئیسماعیل شوکر ڕەسول، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر ـ مێژووی کۆن، مێژووی ئیسلام، مێژووی نوێ)، لاپەڕە (١٣٨٨).

دابلیو.ئار.هێی، (دوو ساڵ لە کوردستان)، لاپەڕەکانی (١١٧ و ١٣٠ و ١٤٤).

دڵدار جەلیزادە، (باسی گرانی گەورە لە زاری باپیریەوە)، ماڵپەڕی (شاری کۆیە)، (٢٦) ی ئۆکتۆبەر.

ڕۆستەم ڕەسوڵ ئەحمەد ئانگۆزی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٧/٨/٦ لە گوندی ئانگۆز.

ڕەفیق حەمەد عەبدوڵا چیوەیی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٨/٦/٢٠١٢ لە گوندی چیوەی خوارو.

رفیق حلمی، (یاداشت) بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٢) .

زوبێر رەسول چۆمانی، (گرانی بچوك و گرانی گەورە)، بەشی یەکەم، لە باسی باڵەکایەتیدا، فەیسبوك، لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

سەردار ئیسماعیل سەلیم گردگۆرانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ١١/٨/٢٠١٢ لە شارۆچکەی سەروچاوە.

سابیر حوسێن ئیسماعیل چیوەیی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٨/٦/٢٠١٢ لە گوندی چیوەی خوارو.

سابیر مەلا ئیبراهیم خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢١/٢/٢٠٢٠ لە شاری هەولێر.

سیسیل جۆن ئیدمۆندس، (کورد تورك عەرەب) لاپەڕەکانی (١١٥ و ١٤٠ و ١٤١).

سەعید عەبدوڵا حمد هەرتەلی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ١٢/٩/٢٠١٧ لە کۆمەڵگای شکارتە .

سالح قەفتان، (مێژووی گەلی کورد و نەتەوەی کورد تورکمان نییە)، چاپی چوارەم ساڵی(٢٠١٢)،لاپەڕە(٢٩٥).

شادمان مەلا حەسەن، (کورد سوتەمەنیەکی هەرزانی جەنگ + کورد لە نێوان دوو بەرداشی سوتێنەردا)، فەیسبوك، لە لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

عەنبەر حەمەد ئەحمەد بێتواتی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٧/١/٢٠١٨ لە شاری هەولێر.

عەبدوڵا حەمەدەمین سلێمان سەریکانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٦/١/٢٠١٨ لە گوندی سەرەشکەوتان

عەبدوڵڵا قادر عەبدوڵا بێناتانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٨/٩/٢٠١٢ لە گوندی بێناتان .

عەزیز یوسف رسول شیوەیی، چاوپێکەوتن لە ١٤/٩/٢٠١٢ لە گوندی شیوەی خوارو.

فازڵ هاوردیانی، (هاوردیان)، لاپەڕەکانی (٢٩ ـ ٣٠).

کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین، (کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا)، لاپەڕە (١١٢).

لازاریفـ ن، (مێژووی کوردستان)، لاپەڕە (٣٠٠).

محمد رسول هاوار، (کورد و باکوری کوردستان)، لاپەڕەکانی (٥٤٦ و ٥٤٩ و ٥٥٠).

مەلا برایم خەتی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٣٠/٣/٢٠١٣ لە شاری رانیە.

محەمەد عەزیز عەبدوڵا دواوەیی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ١٦/١١/٢٠١٧ لە گوندی دواوێ.

محەمەد عەبدوڵا خدر سەرسیانی، چاوپێکەوتن لە ٢٠٢٠/١/١٢ لە شارۆچکەی سەروچاوە.

محمد ئەمین زەکی، (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان) بەرگی یەکەم و دووەم،لاپەڕەکانی (١٧٩ و ١٨٠).

مستەفا عبدالقادر ئاورحمان بالیسانی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٤/٢٧ لە گوندی بالیسان .

موخلیس ئیسماعیل ئیبراهیم بالیسانی، لە ڕۆژی ٢٠١٣/٥/٣٠ زانیاریەکانی بە دەستنوس بۆ ناردم.

م.محمدحسن سەرگەینێلی، (هۆزی ئاکۆ لە نێوان مێژووی کۆن و نوێدا)،لاپەڕەکانی (٣٩٨ و ٣٩٩ و ٤١١).

ممدوح مزوری، (مێژووی ڕواندز)، لاپەڕەکانی (٢٨٨ ـ ٢٨٩).

محمد ئەمین زەکی، (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان)، بەرگی یەکەم و دووەم،لاپەڕەکانی (١٨٠ و ١٨١).

هاوکار عبدالله شێخ وەسانی، (دین و جیهانبینی مەلای گەورە)، کتێبی ـ ١ ـ لاپەڕە (١٧٧) .

نەجمەدین شێخ کەریم، (شەڕی جیهانی یەکەم ١٩١٤ ـ ١٩١٨ ز)، گۆڤاری (k٢١)ل اپەڕە (٦٧) لە فەیسبوك.

نازەنین محمد وهبی، عەتا عەبدوڵلا معروف، دارا محمد عبدوڵا، (مێژووی نوێ و هاوچەرخ ـ بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی) لاپەڕە (١١٤ و ١١٥).

نوری بەکر عەبدوڵا خەتی، چاوپێکەوتن لە شەوی ٢٠١٢/٩/٢٨ لە گوندی خەتێ.

## پەراوێز:

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان...)، لە گۆگڵ، لە ژمارەی رۆژی ٣١/٧/٢٠١٩، لێرەدا بە دەستکارییەوە کورتەیەکی لێ وەردەگرین.

جەلیلی جەلیل، م.س.لازاریف، م.ا.حەسرەتیان، شاکرۆ محۆیان، ئۆلگا جیگالینا، (شۆرشەکانی کورد لە سەردەمی نوێدا) لاپەرە (١٤٢).

رفیق حلمی، (یاداشت)، بەشی یەکەم،لاپەرە (٣١).

خالید حوسێن، (سەفەربەلك یان سەفەر بەرلك)، لەلاپەرەی تایبەتی خۆی لە فەیس بوك لە (١٤)ی نوفمبری (٢٠١٨).

## نۆیەم: مردن بە هۆی زۆرخواردن، لە کاتی برسیەتی یەتیدا

ئەگەر برسیەتیش لە ئارادانەبێت، زۆرخواردن زیان بە تەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت، با بزانین لە کاتی برسی یەتیدا ئەوانەی بۆ ماوەیەك برسی بوون و دواتر خواردنیان دەستکەوتووەو زۆریان خواردووە، باری تەندروستی یان بە چی گەیشتووە و چارەنوس بۆ کوێی بردون...

**تاهیر احمد حەوێزی:** (دوو کەسی عەشیرەت، لە گوندێکی دێنە ماڵێکی، داوای نانی دەکەن، ژنەکەش تەشتی نانیان لە بەر دەمیان دادەنێ و دەست بە خواردنی دەکەن، لەو کاتەی مێردەکەی دێتەوە، بە ژنەکەی دەڵێ: (دەك خێرت نەنوسێ)، دەڵێ: بۆ؟ پیاوەکە دەڵێ: (ئەوانە بێ تاقەتن و برسیشیانە، ئێستا ئەوەندەی دەخۆن، دەمێکی کە دەمرن، ئەوجا ئەمن زەلامی لەکێ بینم بیانشێرمەوە ؟! کەتێر دەخۆن، لە نزیك ئاوایی لە کەندێکا هەردووك دەمرن! چونکە ماعیدەو ڕیخۆڵەکانیان وشك بوو بۆوە، پێ حەل نەکرابوو، وە هەر لە جێی خۆیان هەندێك گڵ و خۆڵیان بەسەردا کردبوون).

**حەسەن سەعید بەگ خەلیفەیی،** لە سەر زاری ژنە بەتەمەنەکە بە ناوی (سێوە)، دەڵێت: (لە نزیك کۆیە پارچە جۆیەك کەوتە پێشمان تازە گوڵی گرتبوو ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی برسی ڕوویان تێکرد هەندێکیان هێندە زۆر فەریك

جۆیان خوارد دوای تێربونیان هەر لەنێو جۆیەکەدا کەوتنە سەر پشت و گیانیان لە دەستدا) .

**ئیبراهیم ئیبراهیم میاوەلی:** دایکم گێڕایەوە و وتی: (ڕۆژێکیان گەنجێکی تەمەن (٢٠) سالاَن، لە سەرەنگوێلکی نزیك مالّی ئێمە، لوولاقە ولاَغێکی بە دەستەوە بوو دەیکڕاندەوە ـ (دەی کورستەوە) و دەیخوارد. دەلّێت: عبدولاَی براشم مندالّ بوو چاوی لێ بوو، هات بۆلای دیکم و دەستی بە گریان کرد و ووتی: دایە دوو نانم بدەرێ بۆ ئەو کوڕە وا لە برسان ئێسکە ولاَغ دەکرێنێتەوە، دایکم وتی: دوو نانەکەم دایەو چووە مالّەکەی دراوسێمان و دوو نانیشی لەوێ هێناو بۆی برد، کوڕەکە نانەکە دەخوات و دەلّێت: جامێك ئاویشم بدەنێ، ئاوەکەیشی دەدەنێ، کە ئاوەکە دەخواتەوە، بەلادا دەکەوێت و تەمەنی درێژی بۆ حازری بە جێ دەهێلّێت).

## پەراوێز:

ئیبراهیم ئیبراهیم میاوەدەلی، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی میاوەدەلی پشدەر)، بەرگی یەکەم، لاپەڕەکانی (١٣٨ ـ ١٣٩).

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم، لاپەڕە (١٣٣).

حەسەن سەعید کەریم خەلیفەیی، چاوپێکەوتن لە شەوی ١٤/٤/٢٠١٢ لە کۆمەڵگای شکارتە.

## پەند و ئامۆژگاریەکان:

پەند و ئامۆژگاری ئەزموونی ژیانی مرۆڤن، بایەخ پێدانیان لە ئێستاماندا پێویستی یەکی گرنگە.

**هاوکار عبدالله شێخ وەسانی:** مامۆستای گەورە لە تەفسیرەکەیدا، پێمان دەڵێت: **( دەبوایە میللەتی کورد هەرگیز، ڕۆژانی گرانی لە بیر نەکات، بەڵام بە داخەوە زوو لە بیریان کرد و پەندیان لەم کارەساتە گەورەیە وەرنەگرت)** .

لێرەدا مەبەست لە مامۆستای گەورە، مەلای گەورە ـ مەلا محمدی کۆیەیە.

**ممدوح مزووری:** جونکە خەڵکەکە هەموی سەربازبوو تواناى جاندنی دەغڵوو دانیان نەبوو، سەرەرای ئەوە خەڵکەکی زۆر لە بەرەی شەر کوژرابوو، پیاو و مرۆڤ کەم بووبوون پیاو نەبوون ئیش بکەن، تا ئەم رادەیە ژنان ئەم پەندەیان ئەگۆ : **(ماڵت خرابیی ئەڵەمان، مێردت کردن بەدەرمان، ژنت کردن بەخەرمان).**

**مەلا ڕسوڵ حەمەد وەرتی:** دایکم خۆی لە ناو ڕووداوەکان بووە، ئامۆژگاری دەکردین و دەیگوت: **(کوڕم، قەت نەکەی نانی فڕێ بدەیت، یان بڵێی ئەوەی دەخۆم ئەوەی ناخۆم، هیچ کاتێك خواردنی زیاد لە پێویست ئامادە نەکەن، ئەوەت لە بیربێت، نەکەی دەغڵ و دانەوێڵەت لە ماڵێدا ببڕێت، هەرمن دەزانم برسیەتی چ کارەساتێك دەنێتەوە).**

**حوسێن مستەفا سوڕیی:** ئەنکم ناوی (عائیشە) بوو، زۆر جار ئەو پەندەی دەگووت: **(کە تورك هاتن، نانی لەسەر سێلێ بەجێ بهێڵن یا بسوتێ، بڕۆن).**

**ڕەسوڵ عەبدوڵا بێتواتی و ئەحمەد حوسێن مەلۆکی:** پێشینان گووتویانە: **(کە تورك هاتن، نانی لەسەر سێلێ بەجێ بێڵن، کە ئینگلیز هاتن، نەمامان بچێنن)؟!.**

**عەزیز قادر مەلەکی و مەغدید حوسێن مەلەکی:** پێشینان گووتویانە: **(کە ڕووس هاتن دەرکێ وەکەن، کە تورك هاتن دەرکێ داخەن).**

**محەمەد عەبدوڵا سەرسیانی:** پێشینان گوتویانە: **(کە ڕووس هاتن، فەراحنایی دێت، کە تورك هاتن، چاڵەگەنمانیش دەردێنن).**

**عەبدوڵا حەمەدەمین توتمەیی:** پێشینانمان دەیانگوت: **(کە تورك هاتن، نانی لەسەر سێلێ بە جێ بێڵن، کە ڕۆم هاتن، نەمامان بچێنن).**

ئەو پەند و ئامۆژگاریانە، لە ئەنجامی کردار و هەڵسوکەوتی حکوومەتە شەڕکەرەکان گوتراون، بۆ ئێستاکەش پێویستە بە هێند وەربگیرێن و پشتگوێ نەخرێن، سەبارەت بە ڕۆمەکان کە بە پێی لێکۆڵینەوەکە هیچ دەورێکیان لە کوردستاندا نەبووە، وای بۆ دەچین لێرەدا مەبەستمان لە ئینگلیزەکان بێت، هەرچەندە ئەوانیش لە هەندێك شوێندا بە خراپ باسیان کراوە. وە سەبارەت بە ڕووسەکانیش، لە یەکێك لەو پەند و ئامۆژگاریانەدا بە باش باسیان کراوە، هەرچەندە لە لێکۆڵینەوەکەدا چەندین نموونەمان لە سەر خراپەکاری ئەوان تۆمارکردووە!.

## پەراوێز:

ئەحمەد حوسێن مەحمود مەلۆکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٩/١ لە گوندی مەلۆك.

حوسێن مستەفا حوسێن سوێری، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٧/١٢/١٤ لە کۆمەڵگای شکارتە.

ڕەسوڵ عەبدولا ڕسول بێتواتی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٧/٩/٢٣ لە گوندی بێتواتە.

عەزیز قادر ئەحمەد مەلەکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٦/١١ لە کۆمەڵگای شکارتە.

عەبدولا حەمەدەمین یاسین تۆتمەیی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٩/٨/٩ لە گوندی تۆتمە.

ممدوح مزوری، (مێژووی ڕواندز) لاپەڕەکانی (٢٨٨ و ٢٨٩).

مەلا ڕسوڵ حەمەد وەرتی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٩/٩/٢٥ لە گوندی وەرتێ.

مەجید حوسێن خدر مەلەکی، چاوپێکەوتن لە ڕۆژی ٢٠١٢/٦/١١ لە کۆمەڵگای شکارتە.

هاوکار عبدالله شێخ وەسانی، (دین و جیهانبینی مەلای گەورە)، کتێبی ـ ١ ـ لاپەڕە (١٧٤) .

## چەند هۆنراوەیەك لە باسی گرانیەکەدا:

لەو هۆنراوەیەی (مەلا حەمدون) دا، کە باس لە سەفەربەلك و بارودۆخی ئەوکات دەکات، جەمال بابان، لە پەڕتوکی (سلێمانی شارە گەشاوەکەم)، و محمد رسول هاوار، لە پەڕتوکی (کورد و باکوری کوردستان) دا تۆماریان کردووە، کاتێ هۆنراوەکە لە هەردوو پەڕتوکەکە بەراورد دەکەین، جیاوازیەکی زۆر بەدی دەکرێت، بۆیە ئێمە لێرەدا هەردووکیان دەخەینەڕوو .

هۆنراوەکەی (مەلا حەمدون) لە پەڕتوکی کورد و باکوری کوردستاندا:

ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کە دنیا شڵەژاوە

هەر کەس بە جەخارێ جگەری قیمە کراوە

دنیا پڕی ئاشوبە، خەلابق بە عمومی

ئاسایشی لێ مەنعە، ئەڵێی جونبوشی ئاوە

وەك تەرزە ئەبارێ بە هەموو دەم، ئەسەف و خەم

هەوری غەزەب و قەهری خوا، توند و بە تاوە

ئەم وەزعە کەناوی بە (سەفەربەر) ئەبەن ئیمڕۆ

فەرمانی بە خوێن ڕشتنی ئەم عالەمەی داوە

گیرۆدەیە ئەم عالەمە، هەر کەس بە سییاقێ

کەوتۆتە کەشاکەش، بە قومانەی ئومەراوە

(ژەندرمە) ئەسورێتەوە وەك واشەیی برسی

بۆ لاشەیی میللەت، بە فڕوفێڵی غەزاوە

فەوتاوە بە سوغرە، كەر و ئێستر و یابوو

حوشتر سەقەت و شەل بووە، گا پشتی شكاوە

كەر شەوقی زەڕینی نی یە هەتا لە بەهارا

ترسی هەیە، نەك بیخەنە ژێر باری قەزاوە

بۆ گرتن و بۆ كوشتنی ئەو عالەمە یەكسەر

ئەم عرسەیی ئافاتە ئەڵێی حەڵقەیی داوە

نێك و بەدی ئەم عالەمی ئیسلامە بەجارێ

كەوتونەتە ژێر حەلقەیی زنجیری بەلاوە

هەر شەش جیهەتی گرتووە ئاشوب و مسیبەت

مێشولە مەجالی نی یە بفڕێ بە هەواوە

ئەم زاڵمی سفاكی (سەفەر بەرلكە) ئیمڕۆ

نامەی فەرەحی داوە بە دەم بادی سەباوە

تەیارە بە ئەسبابی شەڕ و فیتنەوە دایم

جەولانی ئەڵێی هەورە بە سەر مركزی باوە

باڵۆنی هەڵۆ شێوە لە گەڵ دێتە بزوتن

عالەم لە نەزەریا هەر ئەڵێی پۆڕی خوراوە

ئەم جووتە بەلازادەیی باڵندەیە ئیمڕۆ

سیارە بە سەیالەی برقی بە هەواوە

برق و غەزەبی دانەیی نارنجەك و بۆمبا

ئاگر دەپرژێنێ بە زەمیندا لە سەماوە

شەوو ڕۆژ لەبەر برقی قلیج ڕم و سونگی

لەمعە قەسەتۆرە بەدەلی عەکسی هەتاوە

لەو ڕۆژەوە دنیا هەیە تا ئەم دەمە بێ شك

مەغلوبەیی بەم غایەتە،نەبووە و نەکراوە

بنچینەی دەرکەوتووە ئاساری شەریعەت

یەکسەر هەرەسی بردووە ئانێکی نەماوە

ئەم دینە لە پێشدا وەکو زەمزەم بوو بە ڕونی

هیچ غەشی نەبوو،ئیستە دەڵێی لێڵی قوڕاوە

یارەبی لەبەر خاتری پێغەمبەرەکەی خۆت

ڕەحمێ بکە بەم کۆمەڵی ئیسلامە کەماوە

لەت لەت بووە بەم چەکوشە سەعاتی دڵی عالەم

ڕەقاس و جەڕو زەمبەلەك و چەرخی سواوە

(حمدی) دڵی یەخسیری فەڕەنگی خەمە ئیمڕۆ

بەربوونی بە بەربوونی گەروی (بەسرە) و (فاوە) ە.

**جەمال بابان:** (زۆر لە شاعیرەکانمان کە خۆیان لە ئاگری شەڕەکەدا ژیاون و چاوگ بوون بۆ خۆشکردن و پەرەسەندنی شەڕ، کوشتن و بڕین و ئەنجنکردنی مرۆڤ، قات

و قڕی و له برسا مردن و زوڵم زۆر... ئەمانەیان هەموو وەك شریتی سینەما هۆنیوەتەوە و خستویانەتە پێش چاو، وا ئێمە لێرەدا دوو سێ نموونە لەو هەڵبەستانە دەنووسینەوە، لەپێش هەموویاندا هەڵبەستەکەی (مەلا حەمدوون)، کەخۆی پیاوێکی نابینا بوو، بەلاّم بگرەو بەردەو کارەساتی شەڕ، وا کاری لێ کردبوو، وەك یەکێکی چاوساغ،باسی شتی وا وردی شەڕ دەکات، بەچاو ساغیش بەو جۆرە وەسف ناکرێت، جا گوێ بگرن لەو چەند بڕگە شیعرەی مەلا حەمدون:

ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کە عالەم شڵەژاوە

هەر کەس بە جەخاریێ جگەری قیمە کراوە

دنیا پڕی ئاشوبە،خەلایق بە عمومی

ئاسایشی لێ مەنعە،ئەڵێی جونبوشی ئاوە

وەك تەرزە ئەباریێ بە هەموو دەم،ئەسەف و خەم

هەوری غەزەب و قەهری خوا،توند و بە تاوە

ئەم وەزعە کەناوی ئەبەن ئەمڕۆ بە (سەفەربەر)

فەرمانی بە خوێن ڕشتنی ئەم عالەمە داوە

گیرۆدەیە ئەم عالەمە،هەر کەس بە سیباقێ

کەوتونە کەشاکەش،بە قوماندەی ئومەراوە

(ژەندرمە) ئەسوڕێتەوە وەك واشەیی برسی

بۆ لاشەیی میللەت،بە فڕوفێڵی غەزاوە

فەوتاوە لەبەر سوغرە،کەر و قاتر و یابوو

حوشتر سەقەت و شەل بووە،گا پشتی شکاوە

کەر شەوقی زەڕینی نی یە هەتا لە بەهارا

ترسی هەیە،نەك بیخەنە ژێر باری قەزاوە

ڕووسی غەم و ئینگلیزی خەفەت،هەردوو بە جارێ

هاتونەتە سەر مەمنی عوشرەت بە سوپاوە

ئەم زالمی سەفاکی(سەفەر بەرلگ)ە ئەمڕۆ

نامەی فەرەحی داوە بەدەم باری سەباوە

عاجز بووە قابز،لە قەبز کردنی ئەرواح

مەودایی دەمی تیغی ئەجەل،نەخشی سواوە

دەشت و جەبەل و شیوو جزیرەو هەموو دنیا

گولگون بووە،ڕەنگینە بە خوێنی شوهەداوە

تەیارە بە ئەسبابی شەڕ و فیتنەوە دایم

جەولانی ئەلێی هەورە بە سەر مرکزی باوە

بالۆنی هەلۆ شێوە لە گەڵ دێتە تەحەڕوك

عالەم لە نەزەریا بە مەسەل پۆڕی خوراوە

پاپۆڕ و سەفینە و بەلەم و کەشتی و قایخ

ئامادەیی حەربن،بە هەموو موسلیحی ئاوە

پڕ گەردی غەم و دەردە سەعاتی دڵی عالەم

ڕەققاس و جەڕ و زەمبەلەك و چەرخی شکاوە
بەرقی غەزەبی دانە و نارنجەکی بۆمبا
ئاگر دەپڕژێنێ لە زەمینداو لە سەماوە
شەو ڕۆژە لەبەر بەرقی قلیج و ڕم و سوننی
لەمعەی قەسەتۆرەش بەدەلی عەکسی هەتاوە
عالەم لە شریخە و شەڕەڕی دومدومی بۆمبا
حەیران و سەراسیمەوو عەقڵی خەرەفاوە
لەو ڕۆژەوە دنیا هەیە تا ئێستەکە بێ شك
مەغلوبەیی بەم غایەتە،نەبووە و نەکراوە
تاحوکمی تەماشایی تەسەور لە هەموولا
هەر لاشەیی جنراوە سەرو دەستی شکاوە
هەر شەش جیهەتی گرتووە ئاشوبی موسیبەت
مێشولە مەجالی نییە بفڕێ لە هەواوە
ئەم دینە لە پێشدا وەکو سەر چەشمەیی زەمزەم
بێ غەش بوو،ئەمێستاکە ئەڵێی عەینی قوڕاوە
یاڕەبی لەبەر حورمەت و ئیکرامی موحەمەد
ڕەحمێ بکە بەم باقی ئیسلامە کەماوە
(حمدی) دڵی یەخسیری فەڕەنگی خەمە ئیمڕۆ
بەربوونی بە فەتحی فەرەجی(بەسرە)و(فاوە)ە.

**جەمال بابان:** باسی بوێژێکی تری کورد دەکات بەناوی (حاجی میرزا عەبدوڵا کۆیی)، کە بە (خادیم) ناسراوە و خۆی لە سەفەربەلکدا سەرباز بووە، وە بەیتێکی ئەوی لە باسی سەفەربەر بەو شێوەیە لە پەڕتوکەکەدا تۆمارکردووە:

سەفەربەلك کرا ئیعلان لە عالەم
سەقەر بوو بۆ عەزابی جوملە عالەم
عەساکیر بێ لباس و نان لە سەنگەر
لە شەڕدا بوون بە تۆپ و تفەنگ و خەنجەر
کەر و ئینسان و ئێسترە پیەو بارگیر
ئەیانگرتن لە بازاڕا بە ڕەشبگیر
جەنابی کاکە جندرمەش لەلایێ
لە شارو دێیەکان ببووە بەلاییێ
لە بۆ ئینسان وەکو گورگ و بەراز بوون
لە بۆ مریشکان چەقەڵ بوون حیلە باز بوون
هەموو ڕۆژێ شەهیدی ئەم غەزایە
بە (تەل) ئەدرا خەبەر هەرچەند بوایە
لە هەر ماڵێ قیامەت هاتە مەیدان
لە دەنگی شیوەن و گریان فوغان
گرانی هاتە ڕوو، ڕووی تێ دەکردن
ئەوەی مابوو هەموو یەك یەك دەمردن

لە هەر شیوێ پردێ لاشەی بەشەر بوو

پڕی ئێسقانی دەست و پێ و سەر بوو

ڕقی گەورەم لە شێخ و هەم مەلایە

ئەیانگوت ئەی موسڵمانان غەزایە

زەمین ئەیگوت: بە گوێچکەی ئاسمانان

قیامەتتان نەدیوە وەرنە سەیران.

**جەمال بابان:** هۆنراوەیەکی (عارف سائیب) ی لە کتێبەکەیدا تۆمار کردووە ، کە ئەویش سەرباز بووە لەو شەڕەدا، وەکو:

کەوتمە ناو تاقمێ جندرمە خوا مەرگ

دوچاری هەزار دەردی سەری و قەهر و سزا خۆم

ڕۆژێك خەبەری حەرب و دەمێك مژدەیی سوڵحە

ئوفتادە لە ناو دەغدەغی خەوف و ڕەجا خۆم

برسی و ڕەش و ڕوت،چڵکن و بێ پارەو توتن

حەسرەت کەشی دوو قوم جگەرەو پیاڵەیە چا خۆم

کافر بە زەیی دێتەوە بەم حاڵە پەشێوە

وا دەر بەدەر و قوڕ بەسەر و توشی سزا خۆم

بێ شوبهە لەبەر دەرد و غەم و قەهر و مەرارەت

مەحجوب و سەر ئەفگندەیی جەمعی شوهەدا خۆم

(عارف) ئەسەری مەرحەمەت و لوتفی خودایە

بۆ مەنفەعەتی دین و وەتەن جان بەفیدا خۆم.

## پەراوێز:

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەکەم)، بەرگی یەکەم و دووەم، لاپەڕەکانی (١٨١ و ١٨٤ و ١٨٥).

محمد رسول هاوار، (کورد و باکوری کوردستان) لاپەڕە (٥٥٢).

## کۆتایی هاتنی گرانی و قاتوقڕی:

هەرچەندە ساڵی (١٩١٨)، بە ساڵی کۆتایی هاتنی گرانی و قات و قڕی دیاری کراوە، بەڵام تا چەند ساڵێك دواتریش، دۆخە ناهەموارەکە بە کەمێك جیاوازیی یەوە، لە هەندێك ناوچە بەردەوام بووە، بەتایبەتی ئەو ناوچانەی لە ژێر دەستەلاتی عوسمانیەکاندا مابوون .

**ممدوح مزوری:** (ئینجا خەڵکەکە وەها مایەوە بێ دەغڵ ودان، ئەو گرانی و برسیەتی و مردنە هاتەوە، گەر ئینگلیز نەگەیشتابا کوردستان، لەو بروایە دابە میللەتی کورد لە سەدا (٩٠) نەدەما، گەر هەمووشی نەچووبا، بەڵام بەهاری ١٩١٨ داهات، شیر و گیا پەیدا بوو، خەڵکەکە قەناعەتێکی پێ کرد، وە ئینگلیزیش گەیشتە رواندز پارەو پولێکی زۆری بەبراگەوران بەخشی وە ئازووقە و دەغڵ و شەکر و جا و کوتاڵێکی زۆریشی بەسەر خەڵکەکەیدا بلاو کرد. ئەنجا بەوە خەڵکەکە ژیاوە و دەستی کردەوە بەجوت و چاندنی دەغڵ و دان، ئەوسا دەغڵ و دان هاتە ناو، خەرمانیان هەڵگرتن و فەرەحنایی لەوڵات پەیدابوو، پاشان ئەو خەڵکەی هەڵاتبوو گەراوە رواندز و سەر لەنوێ شاری رواندز ئاواکراوەو ئاوەدان بووە) .

**مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی:** (لە کۆتایی شەڕداو ڕوخانی عوسمانیەکان و کشانەوەی ڕووسەکان، خەڵکەکە (خەڵکی ڕواندز) زۆر شپرزە بوون، لە برسان لە

بلاوبوونەوەی نەخۆشی، تاکو هاتنی ئینگلیزەکان، کە هەندێك یارمەتی خەڵکیاندا، بە ئازوقەو کەلوپەلی پێویست) .

**سیسل جۆن ئیدمۆندس:** (یەکەم ئەرکی (نوێڵ) ئەوە بوو، کە بۆ برسی و ڕوتەکان خۆراك و جل و بەرگ و بۆ وەرزێرەکان تۆی چاندن و ئامرازی کشتوکاڵ دابین بکات، ئەو یارمەتیە مرۆڤ دۆستانەیە هەرگیز لە بیر نەکراو، ساڵانی دوایی زۆر جار باسیان لێ دەکرد و .....هیتد) .

لێرەدا مەبەست لە شاری سلێمانیی یە، وە (نوێڵ) بەرپرسێکی ئینگلیز بووە، کە ئەو کاتە هاتووەتە شارەکە.

**دابلیو. ئارر هێی:** (نرخەکان کە پێشتر بە شێوەیەکی نا ئاسایی بەرز ببونەوە، دوای چەند ڕۆژێك لە گەشتنی من، سەدا پەنجا دابەزین) .

دابلیۆ ئار هێی، بەرپرسێکی ئینگلیز بووە و باس لە ئەو کاتی شاری کۆیە دەکات .

**سێر ئارنۆد ولسن:** (ئەرکی یەکەمان چارەسەرکردنی ئەو هەژاریە بوو کە باڵی بەسەر شارەکەدا (سلێمانی) کێشابوو هەروەها چارەسەرکردنی برسیەتی بلاو لە هەموو شوێنێ ، بەشێکی گەورەی شارۆچکەکە ، لە سەردەمی تورکان وێران بوو بوو ، ماوەیەکی درێژ بوو بزوتنەوەی بازرگانی لە شارەکەدا وەستابوو ، دەڤەرەکانی دەوروبەریشی بەرادەیەکی ترسناك هەژاربوون .لە باسی گەیشتنیان بە (باتاس و ئاکرێ و دەهۆك)دەڵێت: گەیشتنمان بەوێ لە سەرەتادا مایەی خۆشحاڵی بوو،چونکە ئێمە ئەو ئامرازانەمان ئامادەکرد ،کە بە هۆیەوە وێرانی و برسیەتی

، کە تورکەکان بە جێیان هێشتبوو ، لەناو برد. یارمەتیەکانمان بەبێ لایەنگری بەسەر موسڵمان و مەسیحیەکان دابەش کرد) .

**تاهیر احمد حەوێزی:** (لەپاش گرانی یەکە، کابرایەك پرسی بە جەنابی مەلای دەکا: قوربان شایی دەکەم، دەمەوێ لە بۆ کوڕەکەم ژن بێنم، مەلای گەورەش پێی دەڵێ: هێشتا کەلاکی براو خزمەکانت، لە ناو قەبری نەڕزیون، کە لە برسان مردن. وە نەیهێشت شایی بکا) .

لێرەدا مەستی لە مەلای گەورەی کۆیێ یە، کە خۆی لە نێو ڕووداوەکاندا بووە و زۆری لە سەر نوسیوە.

**ئی.جەی.بار:** (دەست بە جێ هەنگاو نرا بۆ چارەسەرکردنی برسیەتی، هێنانی دانەوێڵە لە هەولێرەوە ڕێك خرا، فریاکەوتنی هەژاران دەستی پێ کرد، لە کاتێکدا کشتوکاڵ کردن بۆ لەمەودوا هاندراو ڕادەیەکی قانون و ڕێکوپێکیش چەسپێنرا) .

لە باسی گەیشتنی هێزی ئینگلیز بۆ ڕواندز.

**پەیسەر پرێس:** (دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، کورد نەك هیچی پێ نەبڕاو هیچ دەستکەوتێکی بەر نەکەوت، بەڵکو نەبووە خاوەنی موڵك و خاکی خۆی و ئەوەشی هەیبوو لە دەستیدا، چونکە کوردەکان لە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی، بەشداری جەنگیان کرد، دەوڵەتی عوسمانیش دۆڕاوی جەنگ بوو، دەوڵەتە براوەکانی جەنگ، بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان، دەوڵەتی عوسمانییان دابەشکرد، لەوانەش کوردستان، کەپارچە پارچەو دابەشکرا. لە سەردەمی ئینگلیزەکاندا هێشتا

برسیەتی بەردەوام بوو، بەڵام بۆ ئەوەی جێگای خۆیان بکەنەوە، کەوتنە بوژانەوەی خەڵك و بازاڕەکان) .

**شادمان مەلا حەسەن:** (کاتێ ئینگلیز گەیشتە خانەقین، خەڵکی ئەو ناوچەیە زۆر زوو پێشوازییان لێ کرد، چونکە لە ڕووس و عوسمانی باشتر بوون بۆ خەڵك. ئاماژەکانی شکستی گەورەی دەوڵەتی عوسمانی ساڵی (١٩١٧) لە جەنگ، بە تەواوی بەدەر کەوتبوو، باری خەڵکی کوردستان تا دەهات قورستر دەبوو، چونکە کوردستان زیاتر بوو بوو بە مەیدانی جەنگ، ئەنجام ڕۆژی ٣٠/١٠/١٩١٨ دەوڵەتی عوسمانی خۆیدا بە دەستەوە، لە ڕێککەوتنێك بەناوی (مۆدروس)، کە لە میناى دورگەی لیمۆنسی یۆنانییە، بەم ئاگر بەستە دەوڵەتی عوسمانی تەواوی کردە جەنگیەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕاگرت و چەندین مەرجی هاوپەیمانانی بە سەردا سەپێنرا. جەنگ تەواو بوو، ئەوەی دەست بەتاڵ مایەوە کورد بوو، چونکە بە دوای سەرابێك کەوتبوو، کەوا هەرگیز نەگەیشت پێی) .

**کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین:** (ئینگلیزەکان سودیان لەو بارە نالەبارە وەرگرت و سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتنیان بە دەست هێنا. لە ٣١ تشرینی یەکەمی ١٩١٨، هەواڵی ئاگربەست بەر گوێی سەربازە تورکەکان کەوت. هێزەکانی بەریتانیا لەو کاتەدا، لە باشوری کوردستان لە سەر هێڵی گشتی (خانەقین ـ کفری ـ کەرکوك ـ گەیارە ـ عەنا) بوون، سەرباری ئاگربەست ئەو هێزانە بەردەوام بوون لەسەر پێشڕەوی خۆیان تا موسڵیشیان نەگرت نەوەستان. بەم چەشنە جەنگی یەکەم لە بەرەی ڕۆژهەڵات دیماهی هات، ئەو جەنگە وەك ونستۆن

چەرچڵ دەڵێت: جیاوازی لە گەڵ هەموو شەڕە کۆنەکان هەبوو، لەلایەنی هێزی لەبن نەهاتوی لایەنە شەڕوانەکان و هەبوونی هۆکاری خاپور کردنی مەترسیدار. هەروەها جیاوازی لە گەڵ هەموو شەڕە نوێیەکانیش هەیە، لەو دڕندەییەی کە تیایدا ئەنجامدرا، ئەو شەڕە هەموو مەرگە ساتی سەدەکانی بە خۆوە گرتبوو، بە تەنیا سوپا نەخرایە جەنگەوە، بەڵکو گەلان بە تەواوی خرانە نێو کورەکەیەوە، هەموو هەوڵێك درا بۆ برسی کردنی تەواوی نەتەوەکان، بە بێ گوێدانە ڕەگەز و تەمەن، تا خۆیان بە دەستەوە بدەن. کوردستان بووە گۆڕەپانی ئەو جەنگە ترسناکە لە بەرەی ڕۆژهەلات. بۆیە بەشێکی زۆر گەورەی زیانەکانیش بەر ئەو کەوت، بەبێ ئەوەی نەدەستی لە جەنگدا هەبێت و نە لە بەرژەوەندی ئەویشدا بووبێت و نە ئارەزوشی لێ بووبێت) ! .

لێرەدا ئەوەمان پێدەڵێن: ئینگلیزەکان فەریادڕەسی خەڵکی کوردستان بوون، دیارە ئەوان عەودالی بە دەستهێنانی کانزا و سەروەت و سامانی ئەو وولاتە بوون، نەك لە ناوبردن و قڕکردنی خەڵکەکەی .

## پەراوێز:

تی.جەی.ئار، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، لە لاپەڕە (٤٩).

پەیسەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کوردستان ـ چیرۆکە ناخ هەژێنەکانی سەردەمی گرانییە گەورەکەی کوردستان)، گۆگڵ، رۆژی ٢٠١٩/٧/٣١.

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە) بەرگی دووەم،لاپەڕە (١٣٣).

دابلیو.ئار هێی، (دوو ساڵ لە کوردستان)، لاپەڕە (١٣٠).

سیسل جۆن ئیدمۆندس، (کورد تورک عەرەب) لاپەڕە(١١٥).

سێر ئارنۆلد ولسن، وەکیلی حاکمی پاشایی بەریتانی لە ماوەی داگیرکاری عێراق و کوردستان، لاپەڕەکانی (١٧٣) و (٢٢٣ و ٢٢٤).

شادمان مەلا حەسەن، (کورد لە نێوان دوو بەرداشی سوتێنەردا + کورد بەدوای سەرابدا وێڵە)، فەیسبوک، لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین، (کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا)، لاپەڕە (١١٣).

ممدوح مزووری، (مێژووی رواندز)، لاپەڕە (٢٨٩).

مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی، (رواندز بالەك برادۆست)، لاپەڕە (٢٧).

## دەرئەنجام:

لە کۆتایی ئەو بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەیەدا، گەیشتینە ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوە:

١ ـ گەلی کورد گەلێکی ئازاو چالاك بووە، چاوی لە دەستی خۆی بەولاوە لە دەستی خەڵکانی تر نەبووە و بۆ بژێوی ژیانی پشتی بە خودی خۆی بەستووە، کەچی دەستەلاتدارە ستەمکارەکانی دەوروبەر لێ نەگەڕاون، بە شێوە ژیانی ئاسایی خۆی بژێت و دووچاری کارەساتی زۆر گەورەیان کردووەتەوە .

٢ ـ گرانی و قاتوقڕی هۆکارێك بووە، بۆ کەم بوونەوەی ژمارەی کورد و خەڵکانی تر لە کوردستاندا .

٣ـ گرانی یەکە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی گرتووەتەوە.

٤ ـ هەر تەنها مرۆڤ نەبووەتە قوربانی ئەو ڕووداوە، بەڵك و ئاژەڵەکانیش دوچاری ڕوداوی جۆراوجۆری مەترسیدار بوونەتەوە .

٥ ـ ئەو کاتیش گەلی کورد هەروەکو ئێستا، گەلێکی بێ کەس و لێقەوماو بووە، هیچ پەناگەیەکی ناوچەیی و نێودەوڵەتی و جیهانی نەبووە.

٦ ـ سەبارەت بە هەڵسوکەوت و کردارە توندو تیژەکانی تورك و ڕووس، بەرامبەر بە (جوو و مەسیحی)، لەو لێکۆڵینەوەیەدا شتێکی وامان بەر چاو نەکەوت، کەچی لەو ماوەیەدا ئەوانیش لە کوردستاندا ژیاون.

٧ـ لێرەدا بە هۆی نەبوونی بەڵگەی پێویست و ئاماری تەواو، بۆمان ڕوون نەبۆوە ئاخۆ ژمارەی ئەوانەی کراونەتە سەرباز و بی سەروشوێن بوون و یان لە برسان مردون چەندە ؟.

## ئامانج:

١ـ پێویستە نەوەی ئێستا و داهاتووی کورد و کوردستان، ئاشنای ئەو کارەساتە بێ، کە لەژێر سایەی دەستەلاتی زلهێزەکانی ئەوکات، بە سەر خەڵکی کوردستاندا هاتووە .

٢ـ ئەو لێکۆڵینەوەیە بکەینە دەستپێك، بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی بەر فراوانتر لە داهاتوودا، بە هاوکاری لێکۆڵەرو توێژەران، وە لەلایەن دەستەلاتی کوردی یەوە پاڵپشتی مادی و مەعنەویمان بکرێت.

٣ـ بە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و نەتەوەیەکگرتووەکانی بناسێنین، لەوێ کاری لەسەر بکەین، بەمەبەستی قەرەبووکردنەوەی خەڵکی کوردستان و پاراستنی لە داهاتودا، بۆ ئەوەی جارێکی تر هەوڵی قڕکردنی نەدرێت .

## سەرچاوەکان:

**پەڕتوك:**

ئی.جەی.ئاڕ، (پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی)، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە (مەهاباد سالّح ئەحمەد)، بنکەی ژین، چاپخانەی شڤان ـ سلێمانی، سالّی ٢٠١١، لاپەڕەکانی (١٢، ١٤، ١٥، ١٦، ١٧، ١٨، ٢٠، ٢١، ٢٧، ٢٩، ٤٩).

ئیحسان رەشاد موفتی، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر ـ مێژووی کۆن، مێژووی ئیسلام، مێژووی نوێ)، بەرگی سێیەم، چاپخانەی (گرین گالۆری ـ لوبنان)، سالّی (٢٠٠٩)، لاپەڕەکانی (١٣٢٩) و (١٣٣٢).

(ــــــ)، ئینسکلۆپیدیای هەولێر ـ مێژووی هاوچەرخ، بەرگ (٤)، چاپخانەی (گرین گالۆری ـ لوبنان)، سالّی (٢٠٠٩)، لاپەڕە (١٥٥٦).

ئیبراهیم ئیبراهیم میراودەلی، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی میراودەلی پشدەر)، بەرگی یەکەم، چاپخانەی بەدرخان ـ سلێمانی، سالّی ٢٠٠٣، لاپەڕەکانی (١٣٦ ـ ١٤٠).

بەختیار محەمەدەمین، (جولەکەکانی کوردستان)، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی بەدرخان، چاپخانەی شەهاب ـ هەولێر، سالّی ٢٠١١، لاپەڕە (١٣٣).

تاهیر احمد حەوێزی، (مێژووی کۆیە)، بەرگی دووەم، چاپخانەی (نمیر ـ بەغدا)، سالّی ١٩٨٤، لاپەڕەکانی (١٣٠، ١٣١، ١٣٢، ١٣٣، ١٣٤، ١٣٥، ١٣٦).

تارق جامباز، (لە ناودارانی دەفەری سۆران ـ شێخ کاکەمینی سەران ١٨٧٤ ـ ١٩٤٠)، چاپخانەی شەهاب ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، لەلاپەڕەکانی (١٦، ٣١، ٣٢، ٣٤).

جەلیلی جەلیل، م.س.لازاریف، م.ا.حەسرەتیان، شاکرۆ محۆیان، ئۆلگا جیگالینا، (شۆڕشەکانی کورد لە سەردەمی نوێدا)، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی (د. عەبدی حاجی)، وەرگێڕانی بۆ کوردی (بەهادین جەلال مستەفا)، دەزگای چاپ و بلاچوکردنەوەی ڕۆژهەلات، چاپخانەی ڕۆژهەلات ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٣، لاپەڕەکانی (١٣٥، ١٣٩، ١٤٠، ١٤٢، ١٤٣، ١٤٦).

جەمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەم، سلێمانی لە ڕۆژی بنیاتنانەوە تا کۆتایی دەستەلاتی بابانەکان)، بەرگی یەکەم و دووەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٢، لاپەڕەکانی (٥٢، ٥٣، ١٧٩، ١٨١، ١٨٤، ١٨٥).

جەرجیس فەتحولا، (وریابوونەوەی کورد ـ مێژووی سیاسی ١٩٠٠ ـ ١٩٢٥)، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی (حەسەن جاف)، بەرگی یەکەم، دەزگای موکریان، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، ساڵی ٢٠٠٩، لاپەڕەکانی (٩٧، ١٠٢، ١٠٣).

دکتۆر ئیسماعیل شوکر ڕەسول، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر ـ مێژووی کۆن، مێژووی ئیسلام، مێژووی نوێ)، بەرگی سێیەم، چاپخانەی (گرین گالۆری ـ لوبنان)، ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەڕە (١٣٨٨) .

دابلیو.ئار.هێی، (دوو ساڵ لە کوردستان)، وەرگێڕانی (لوقمان بایز)، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ڕۆژهەلاّت، چاپخانەی ڕۆژهەلاّت ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٦، لاپەڕەکانی (١١٢، ١١٧، ١٣٠، ١٤٤).

رفیق حلمی، (یاداشت)، بەشی یەکەم، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان، چاپخانەی ڕۆشنبیری و لاوان، ساڵی ١٩٨٨، لاپەڕەکانی (٢٩، ٣٠، ٣١، ٣٢، ٣٣).

سێر ئارنۆد ولّسن، (شۆڕشەکەی عێراق، لەماوەی داگیرکاری بەریتانیا بۆ عێراق و کوردستان)، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی (جەعفەر ئەلخەیات)، وەرگێڕانی بۆ کوردی (سەرمەد ئەحمەد)، دەزگای توێژینەوەی و بلاّوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی ڕۆژهەلاّت ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٢، لاپەڕەکانی (١٧٣، ٢٢٣، ٢٢٤).

سەید مەولود بێخاڵی، (هەولێرم وا دیوەو وابیستووە وا سەرچاوەی گرتووە)، بەرگی چوارەم، بەڕێوەبەرایەتی بلاّوکردنەوەی هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠١٠، لاپەڕە (١٣٣).

سیسل جۆن ئیدمۆندس، (کورد تورك عەرەب)، وەرگێڕانی لە فارسییەوە بۆ کوردی (حامید گەوهەری)، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ئاراس ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٤، لاپەڕەکانی (١١٥، ١٤٠، ١٤١).

ساڵح قەفتان، (مێژووی گەلی کورد و نەتەوەی کورد تورکمان نیە)، بلاّوکراوەی ڕێکخراوی ڕۆشنبیری نیگا، چاپخانەی چوار چرا، سالی ٢٠١٢ ، لاپەڕە (٢٩٥).

عەلی کەندی، (ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە لە ١٩٠١/١/١ تا ١٩٥٠/١٢/٣١)، بەرگی دووەم، بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆژنامەنوسی و چاپ و بلاوکردنەوە، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، لاپەڕەکانی (٩٧، ٩٨).

فازڵ هاودیانی، (هاودیان ـ چەند لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی لە سەر کەلتور و مێژوو و کۆمەلایەتی گوندی هاودیان)، چاپخانەی ڕۆشنبیری ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٢، لاپەڕەکانی (٢٩ ـ ٣٠).

فەقێ شێخ وەسانی، (خۆشناوو دۆو دۆشاو)، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بلاوکردنەوە ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٥، لاپەڕە (٢٣) .

کامەران ئەحمەد محمەدئەمین ـ کامەران مەنتك، (کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا ١٨٩٠ ـ ١٩٣٢)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ و ئۆفیسی دەزگای سەردەم ـ سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٠، لاپەڕەکانی (٤٩، ٩٦، ٩٧، ٩٨، ١٠٧، ١١١، ١١٢، ١١٣).

لازاریف. ن، (مێژووی کوردستان)، وەرگێڕانی لە ڕوسیەوە بۆ عەرەبی (د. عبدی حاجی)، وەرگێڕانی بۆ کوردی (وشیار عەبدولا سەنگاوی)، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ڕۆژهەلات، چاپخانەی ڕۆژهەلات ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٢، لاپەڕەکانی (٢٩٣، ٢٩٨، ٣٠٠).

محمد رسول هاوار، (کورد و باکوری کوردستان، لە سەرەتای مێژووەوە، هەتا شەڕی دووەمی جیهان)، بەرگی یەکەم، بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بلاوکردنەوە

و وەرگێڕان، ساڵی ٢٠٠٦، لاپەڕەکانی (٣٧١، ٣٧٢، ٣٧٨، ٤٢٤، ٥٤١، ٥٤٤، ٥٤٦، ٥٤٧، ٥٤٩، ٥٥٠، ٥٥٢).

محمد ئەمین زەکی، (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان)، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپخانە و ئۆفێستی شڤان ـ سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٤، لاپەڕەکانی (١٧٧، ١٧٩، ١٨٠، ١٨١).

م.محمد حسن سەرگەینێلی، (هۆزی ئاکۆ لە نێوان مێژووی کۆن و نوێدا)، چاپخانەی ڕۆژهەلات ـ هەولێر، ساڵی چاپ ٢٠١٧، لاپەڕە (٣٩٨، ٣٩٩، ٤٠٠، ٤١١).

ممدوح مزوری، (مێژووی ڕواندز)، چاپخانەی منارە ـ هەولێر، ساڵی چاپ ٢٠٠٦، لاپەڕەکانی (٢٨٨ و ٢٨٩) .

مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەلەیی، (ڕواندز، باڵەك، برادۆست... مێژوو، جوگرافیا، کۆمەلآیەتی، ئابوری، پیاوەناودارەکان)، چاپخانەی هێڤی، ساڵی ٢٠١٥، لاپەڕە (٢٦ و ٢٧) .

مەهدی محمد قادر، (ئینسکلۆپیدیای هەولێر ـ مێژووی هاوچەرخ)، بەرگ (٤)، چاپخانەی (گرین گالۆری ـ لوبنان)، ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەڕەکانی (١٤٩١ ـ ١٤٩٢) .

نازەنین محمد وهبی، عەتا عەبدوللا معروف، دارا محمد عبدولآ، (مێژووی نوێ و هاوچەرخ، بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی)، چاپخانەی ئەدیب ، ساڵی ٢٠٠٩، لاپەڕە (١١٤ ـ ١١٥) .

واسیلی نیکیتین، (کورد و کوردستان)، وەرگێڕ (خالیدی حیسامی ـ هێدی)، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر، ساڵی ١٩٩٨، لاپەڕە (٥٧٠ و ٥٧١).

هاوکار عبدالله شێخ وەسانی، (دین و جیهانبینینی مەلای گەورە)، کتێبی ـ ١ ـ، نووسینگەی تەفسیر ـ لە تورکیا چاپکراوە، ساڵی ٢٠١٧، لاپەڕە (١٧٤).

**لەنتەرنێت:**

پەیـ سەر پرێس، (گرانیە گەورەکەی کورد ستان ـ چیرۆکە ناخ هەژێنەکانی، سەردەمی گرانییە گەورەکەی کورد ستان)، گۆگڵ، ڕۆژی ٢٠١٩/٧/٣١

خالید حوسێن، (سەفەربەلك یان سەفەر بەرلك)، فەیس بوك، لەلاپەڕەی تایبەتی خۆی، (١٤) ی نوفمبری (٢٠١٨). وە (تەیمور عەزیز)، لە کۆمێنتێکدا بۆی نوسیوە.

دڵدار جەلیزادە، (باسی گرانی گەورە لە زاری باپیریەوە)، ماڵپەڕی (شاری کۆیە)، (٢٦) ی ئۆکتۆبەر.

زوبێر رەسول چۆمانی، بەشی یەکەم (گرانی بچوك و گرانی گەورە). بەشی دووەم (گرانی گەورە و هۆلۆکۆستی ئێرانیەکان)، فەیسبوك،لاپەڕەی تایبەتی خۆی، لە باسی باڵەکایەتدا.

شادمان مەلا حەسەن، (کورد لە نێوان دوو بەرداشی سوتێنەردا)، (کورد بەدوای سەرابدا وێڵە)، (کورد سوتەمەنیەکی هەرزانی جەنگ)، (کورد لە جەنگی جیهانی یەکەم)، فەیسبوک، لە لاپەڕەی تایبەتی خۆی.

کۆیە ـ چنارۆك، (ناودارانی کۆیە)، فەیسبوك، لە (٢٩) ی ئۆکتۆبەری (٢٠١٨).

م.داود ابراهیم، (گرانی گەورە)، فەیسبوك، لەلاپەڕەی تایبەتی خۆی.ن (٧) ی اکتوبری (٢٠١٨).

نەجمەدین شێخ کەریم، (شەڕی جیهانی یەکەم ١٩١٤ ـ ١٩١٨ ز، سالّی برسیەتی و قات و قڕی گەلی کورد، لە ژێر ئەوسای هەیمەنەتی ئیمپڕاتۆری عوسمانیدا)، فەیسبوك، گۆڤاری (k٢١) لاپەڕە (٦٧)، گۆڤارێکی (کلتوری ـ زانستی ـ مێژوویی ـ بەلگەنامەیی ـ نەتەوەیی) وەرزی ئازادە.

حوسێن ڕابی، (جەنگی یەکەمی جیهانی)، فەیسبوك، لاپەڕەی تایبەتی خۆی، (٤) ی سبتمبری (٢٠١٨).

هێمن عومەر، (بەهاری سالّی گرانی!)، فەیسبوك، پەڕەی تایبەتی خۆی، ٢١ مارسی ٢٠١٦، لە کتێبی (بیرەوەری و ڕوانینەکانی مەلای گەورە) وەریگرتووە.

تێبینی/ ئەو لاپەڕانەی باس لە بابەتی گرانیەکە دەکەن و لە فەیسبوك و گۆگلّ وەکو سەرچاوە سودیان لێ بینراوە، بە کۆپی کراوی و پرێنتکراوی، لەلای خۆمان هەلّگیراون.

**بڵاوکراوە:**

سمایلی مەلای نورەدینی، (دیکۆمێنتی مێژوویی قۆچانە.. مەڕانە)، بڵاوکراوەی (شمشارە)، ژمارە (٠)، مانگی ١ ی ٢٠٠٤، سەنتەری کۆمپیوتەری نڤار ـ ڕانیە، لاپەڕە (٥) .

**دەستنوس:**

فەتحی علی مدریس بێتواتی: لەدایك بووی ساڵانی ١٩٦٠، لە ڕۆژی ٢٥/٤/٢٠٢٠، زانیاریەکانی لە ڕێی فایبەرەوە بە دەستنوس بۆ ناردین.

محمد حسێن حمد ـ هاوڕێ کاوە، لە ساڵی ١٩٦٧ لە گوندی کانی بەردی خۆشناوەتی لە دایك بووە، پێشمەرگەیە، لە ٥/٥/٢٠١٣ ی سەرلەبەیانی، زانیاریەکانی بە دەستنوس لە گوندی کانی بەردەوە بۆ ناردین.

موخلیس ئیسماعیل ئیبراهیم، لە ساڵی ١٩٧٩ لە بالیسانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، کارمەندی ئاسایشی بالیسانە و لە ٣٠/٥/٢٠١٣ دوا نیوەڕۆ، زانیاریەکانی بە دەستنوس لە بالیسانەوە بۆ ناردین.

**چاوپێکەوتن:**

ئەحمەد حوسێن ئەحمەد (حاجی ئەحمەد کاکەسێن هەرتەلی)، لە ساڵی ١٩٣٤ لە گوندی هەرتەلی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ١٥/٦/٢٠١٨ لە کاتی ئێوارە، لە گوندی هەرتەل لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

ئەحمەد حوسێن مەحمود، لەساڵی ١٩٦٢ لە گوندی مەلۆکی خۆشناوەتی لە دایك بووە، کاسبە و لە ١/٩/٢٠١٢ کاتی نیوەڕۆ، لە گوندی مەلۆك لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، لە ساڵی (١٩٥٧) لە گوندی هەرتەلی خۆشناوەتی لە دایك بووە، پێشمەرگەیە و لە ١/٦/٢٠١٧ دوای نیوەڕۆ، لە شاری ڕانیە لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

ئەنوەر عەزیز محەمەد، لەساڵی ١٩٦٨ لە گوندی چیوەی خواروی خۆشناوەتی لە دایك بووە، کاسبە و لە ٨/٦/٢٠١٢ دوای نیوەڕۆ، لە گوندی چیوەی خواروو، لە ماڵی (مەلا رفیق)، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

تۆفیق ئیسماعیل مەحمود، لە ساڵی ١٩٤٣ لە گوندی شێوەی سەرووی خۆشناوەتی لەدایك بووە، کاسبە و لە ٢/٩/٢٠١٢ لە کاتی شەو، لە کۆمەڵگای شکارتە لە ماڵی (وەلی جەمال شێوەیی)، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

حەمەد ئاغیلە حەویز، لە ساڵی ١٩٢٧ لە گوندی بێراوەی خۆشناوەتی لەدایك بووە، جوتیارە و لە ٢٦/٩/٢٠١٢ کاتی شەو، لە گوندی بێراوە لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

حەسەن ڕەسوڵ ئەحمەد، لەساڵی ١٩٣٢ لە گوندی زێوەی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیار و ئاژەڵدارە و لە ٢٠/٧/٢٠١٢ ی دوا نیوەڕۆ، لە گوندی زێوە، لە هاوینەواری خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

حوسێن مستەفا حوسێن، لە ساڵی (١٩٥٨) لە گوندی سوێرێی خۆشناوەتی لە دایك بووە، پێشمەرگەیە و لە ٢٠١٧/١٢/١٤ پێش نیوەڕۆ، لە کۆمەڵگای شکارتە ماڵی خۆی، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

حوسێن حەمید ڕەسوڵ، لەساڵی ١٩٥٥ لە گوندی خەتێی خۆشناوەتی لە دایك بووە، کاسبە و لە ٢٠١٢/٩/٢٨ لە کاتی شەو، لە گوندی خەتێ، ماڵی (حاجی نوری)، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

حلیمە کمال عبدالصمد (حلیمە شێخ کمال سەرانەیی)، لە ساڵی (١٩٤٣) لە گوندی سەرانی نزیك ڕواندوز لە دایك بووە، ژنی ماڵە و لە ٢٠٢٠/٢/٢٥ لە کاتی شەو لە شاری هەولێر چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

حسن مستەفا ئەحمد (حاجی حسن مستەفا بەگ)، لە ساڵی (١٩٣٠) لە گوندی توتمەی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ساڵی (١٩٨٤) ئەو زانیاریانەی لێ وەرگیران.

حسن سعید کریم (حسن بەگ خەلیفەیی)، لە ساڵی (١٩٥١) لە گوندی وەرانگەی بیتوێن لە دایك بووە، کاسبە و لە ٢٠١٢/٤/١٤ لە کاتی شەو، لە ماڵی خۆیدا، لە کۆمەڵگای شکارتە، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

حەسەن حوسێن خدر، لەساڵی ١٩٧٢ لە گوندی کانی بەردی خۆشناوەتی لە دایك بووە، پێشمەرگەیە و لە ٢٠١٢/٩/٢١ کاتی ئێوارە، لە گوندی کانی بەرد، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

حەسەن عبدولاَ حەسەن، لەساڵی ١٩٥٦ لە گوندی شێوەی خوارووی خۆشناوەتی لەدایك بووە، ئەنجومەنی گوندی شێوەیە و لە ٢٠١٢/٩/١٤ دوای نیوەڕۆ، لە گوندی شێوەی خواروو، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

خالید حەمەدەمین مستەفا،لەساڵی ١٩٣٢ لە گوندی هەرمکی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیار و ئاژەڵدارە و لە ٢٠١٢/٦/١٥ دوای نیوەڕۆ، لە گوندی مێرگەسەر، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

خالید یوسف حەسەن، لەساڵی ١٩٥٣ لە گوندی هەرمکی خۆشناوەتی لە دایك بووە، ئەنجومەنی هەرمکە و لە ٢٠١٢/٦/١٥ ی کاتی ئێوارە، لە گوندی هەرمك، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

دارا بەکر سەلیم، لە ساڵی ١٩٥٤ لە گوندی گردگۆرانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیار و ئاژەڵدارە و لە ٢٠١٢/٨/٢٤ ی دوای نیوەڕۆ، لە شارۆچکەی چوارقوڕنە، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

ڕەفیق حەمەد عەبدوولاَ، لەساڵی ١٩٦٦ لە گوندی چیوەی خوارووی خۆشناوەتی لە دایك بووە، مەلای ئاینی یە و لە ٢٠١٢/٦/٨ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی چیوەی خواروو، لەماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

رسول عەبدولاَ ڕەسوڵ، لە ساڵی ١٩٤٦ لە گوندی بێتواتەی خۆشناوەتی لە دایك بووە، فەرمانبەری خانەنشینە و لە ٢٠١٧/٩/٢٣ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی بێتواتە، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

ڕۆستەم ڕەسوڵ ئەحمەد، لە ساڵانی ١٩٤٠ لە گوندی ئانگۆزی خۆشناوەتی لە دایك بووە، خانەنشینی پێشمەرگەیە و لە ٢٠١٧/٨/٦ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی ئانگۆز، لە ماڵی خۆیدا، لە چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

رسول حەسەن ڕەسوڵ، لەساڵی ١٩٣٠ لە گوندی بالیسانی خۆشناوەتی لەدایك بووە، جوتیار و ئاژەڵدارە و لە ٢٠١٢/٩/١٥ ی کاتی ئێوارە، لە ماڵی خۆیدا، لە بالیسان چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

رسول حەمەد (مەلا رسوڵ وەرتی)، لە ساڵی (١٩٤٥) لە گوندی وەرتێی باڵەکایەتی لە دایك بووە، کاسبە و لە ٢٠١٩/٩/٢٥ لە گوندی وەرتێ، لە کاتی ئێوارە چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

سەردار ئیسماعیل سەلیم، لە ساڵی ١٩٥٧ لە گوندی گردگۆرانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٢/٨/١١ ی دوای نیوەڕۆ، لە شارۆچکەی سەروچاوە لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

سابیر حوسێن ئیسماعیل، لەساڵی ١٩٤١ لە گوندی چیوەی خوارووی خۆشناوەتی لەدایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٢/٦/٨ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی چیوەی خواروو، لە ماڵی (مەلا رفیق)، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

سەردار عەبدولرحمان حەسەن، لەساڵی ١٩٧٢ لە گوندی شێخوەسانانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، کادیری (ی.ن.ك)ە و لە ٢٨/ ١٠/ ٢٠١٢ ی دوا نیوەڕۆ، لە شارۆچکەی سەروچاوە، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

سەعید عەبدولاّ حەمە، لە ساڵی ١٩٢٤ لە گوندی هەرتەلی خۆشناوەتی لە دایك بووە، ئاژەڵدارە و لە ٢٠١٧/٩/١٢ ی سەر لە بەیانی، لە کۆمەڵگای شکارتە، لە ماڵی خۆیدا، لە کۆمەڵگای شکارتە، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

ستار مەحمود مەحمود، لەساڵی ١٩٦٣ لە گوندی مەلەکانی خۆشناوەتی لەدایك بووە، پێشمەرگەیە و لە ٢٠١٣/٤/١ ی کاتی شەو، لە گوندی کفرەدۆڵی حاجیاوە، لە ماڵی(عبدالرحمان علی مەلەکی)، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

سابیر ئیبراهیم عبدلاّ (حاجی مەلا سابیر خەتی)، لە ساڵی (١٩٢٧) لە گوندی خەتێی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠٢٠/٢/٢١ لە کاتی شەو لە شاری هەولێر، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

سلێمان ئیسماعیل حمد، لە ساڵی (١٩٤٠) لە گوندی ئاندێکی خۆشناوەتی لە دایك بووە، ئاژەڵدارە و لە ٢٠٢٠/١/١٤ لە کاتی ئێوارە لە گوندی ئاندێك، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا .

عەلی قادر عوسمان، لەساڵی ١٩٢٨ لە گوندی هەرمکی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٢/٩/٧ ی کاتی ئێوارە، لە گوندی مێرگەسەر لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

عەزیز قادر ئەحمەد، ناسراو بە (مامۆ)، لەساڵی ١٩٥١ لە گوندی مەلەکانی خۆشناوەتی لەدایك بووە، پێشمەرگەیە و لە ٢٠١٢/٦/١١ ی دوای نیوەڕۆ، لە کۆمەڵگای شکارتە لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

عائیشە مەلا خدر فەقێ عەبدولاّ بێتواتی،لە سالّی(١٩٢٥)لە گوندی بێتواتەی خۆشناوەتی لە دایك بووە، ژنی مالّە و لە ٢٠١٨/٥/٤ ی پێش نیوەڕۆ، لە شاری ڕانیە لە مالّی خۆیدا چاوپێکەوتنی لە گەلّدا کرا.

عومەر ئەحمەد خدر مەلەکی، ناسراو بە(عومەر سیو)، لە دەوروبەری سالّی(١٩١٨)لە گوندی مەلەکانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٢/٥/١ ی دوای نیوەڕۆ، لە کۆمەلّگای شکارتە لە مالّی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەلّدا کرا.

عەبدولاّ قادر عەبدولاّ، لەسالّی ١٩٢٤ لە گوندی بێناتانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٢/٩/٨ ی دوای نیوەڕۆ، لە مالّی خۆیدا، لە گوندی بێناتان، چاوپێکەوتنی لە گەلّدا کرا.

عومەر ئەحمەد حەمەدەمین، لەسالّی ١٩٥٣ لە گوندی زێخانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، مەلای ئاینی یە و لە ٢٠١٢/٩/١ ی پێش نیوەڕۆ، لە گوندی زێخان، لە خانەقای (شێخ مەلا محمدامین)، چاوپێکەوتنی لە گەلّدا کرا.

عوسمان حەسەن قادر، لە سالّی ١٩٦٩ لە گوندی گۆڕەشێری خۆشناوەتی لەدایك بووە، خانەنشینی پێشمەرگەیە و لە ٢٠١٢/١٠/١٩ ی کاتی شەو، لە شاری ڕانیە ، لە مالّی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەلّدا کرا.

عەزیز یوسف ڕەسولّ، لە سالّی ١٩٤٧ لە گوندی شێرەی خواروو لەدایك بووە، جوتیار و ئاژەلّدارە و لە ٢٠١٢/٩/١٤ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی شێرەی خواروو، لە مالّی (حسن عبدلاّ)، چاوپێکەوتنی لە گەلّدا کرا.

عومەر فەقێ ئەحمەد بابەکر، لە ساڵی ١٩٦٤ لە گوندی شێخوەسانانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، خانەنشینی پێشمەرگەیە و لە ٢٠١٢/٩/١٥ ی سەر لە ئێوارە، لە ماڵی خۆی لە باليسان چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

عەزیز عەبدوڵا عەلی، لە ساڵی ١٩٤١ لە گوندی چیوەی سەرووی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٨/١٠/٢٤ لە کاتی شەو، لە گوندی چیوەی سەروو، لە ماڵی (حاجی یوسف)، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

عەزیز قادر عەبدوڵا، لە ساڵی ١٩٢٩ لە گوندی بێناتانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٢/٤/٢٧ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی وەرێ، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

عەبدوڵا حەمەدەمین سلێمان، لە ساڵی (١٩٣٥) لە گوندی سەریکانی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٨/١/٦ ی کاتی ئێوارە، لە ماڵی خۆیدا، لە گوندی سەرەشکەوتان چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

عەنبەر حەمەد ئەحمەد، لە ساڵی ١٩٣٢ لە گوندی بێتواتە لە دایك بووە، ژنی ماڵە و لە ٢٠١٨/١/٢٧ ی دوای نیوەڕۆ، لە شاری هەولێر لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

عەلی حەسەن عەبدوڵا، لەساڵی ١٩٣٩ لە گوندی شیەی سەرووی خۆشناوەتی لەدایك بووە، جوتیار و ئاژەڵدارە و لە ٢٠١٢/٩/١ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی خۆران، لە ماڵی (عبدلا مستەفا)، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

عبدالرحمان حاجی عبداللە ئانگۆزی، لە گوندی ئانگۆزی خۆشناوەتی لە دایك بووە، کاسبە و لە ڕۆژی ٢٠١٩/٩/٢٢ سەر لە بەیانی، لە شارەوانی سەروچاوە، چەند ڕونکردنەوەیەکی بۆ کردین.

عەبدولاّ حەمەدەمین یاسین ـ حاجی عەبدولاّ، لە ساڵی (١٩٢٨) لە گوندی توتمەی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٩/٨/٩ ی سەر لە ئێوارە، لە گوندی توتمە لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

عبدالرحمان عەلی عومەر، لەساڵی ١٩٥٦ لە گوندی مەلەکانی خۆشناوەتی لەدایك بووە، پێشمەرگەیە و لە ٢٠١٣/٤/١ لە کاتی شەودا، لە گوندی کفرەدۆڵی حاجیاوا، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

قادر ئەحمەد فەرەج مەحمود، ناسراو بە(دێوانە قادر)، لە ساڵی (١٩٥٣) لە گوندی کامەریانی ناحیەی بنگردی بەری مەرگە لە دایك بووە، فەرمانبەرە و لە ٢٠١٢/٥/٢٤ ی پێش نیوەڕۆ لە هۆبەی کشتوکاڵی سەروچاوە چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

کەریم حوسێن سلێمان، لەساڵی ١٩٥١ لە گوندی سوێرێی خۆشناوەتی لەدایك بووە، جوتیارە و لە ٢٠١٢/١٩/٧ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی سوێرێ لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

کەریم شەریف عەبدولاّ، لە ساڵی ١٩٦٩ لە گوندی ئانگۆزی خۆشناوەتی لە دایك بووە، فەرمانبەرە و لە ٢٠١٧/٤/١٨ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی ئانگۆز، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

مەحمود ئیسماعیل مەحمود، لە ساڵی ١٩٤٧ لە گوندی شێوەی سەرووی خۆشناوەتی لەدایك بووە، مەلای ئاینی یە و لە ٢٠١٢/٩/٢ لە كاتی شەودا، لە كۆمەڵگای شكارتە، لە ماڵی (وەلی جەمال شێوەیی)، چاوپێكەوتنی لە گەڵدا كرا.

میر ئەحمەد میرە، لە ساڵی (١٩٢٧) لە گوندی سەركەپكانی دۆڵی شاوڕێی ئاكۆیەتی، لە دایك بووە، جوتیار و ئاژەڵدارە و لە ٢٠١٢/١/٦ سەر لە بەیانی لە گوندی (قەلاّ سەید) ی دۆڵی شاوڕێ لە ماڵی خۆیدا، چاوپێكەوتنی لە گەڵدا كرا.

مستەفا عەبدولاّ عەزیز، لە ساڵی ١٩٤٥ لە گوند چیوەی سەرووی خۆشناوەتی لە دایك بووە، مەلای ئاینی یە و لە ٢٠١٢/٦/٨ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی چیوەی سەروو، لە ناو باخچەكەیدا، چاوپێكەوتنی لە گەڵدا كرا.

محەمەد عەبدولاّ خدر، لە ساڵی(١٩٥١)لە گوندی سەرسیانی بەری مەرگە لە دایك بووە، كارگوزاری شارەوانی سەروچاوەیە و لە ٢٠٢٠/١/١٢ سەر لە بەیانی، لە باخچەیەكی بەردەم شارەوانی سەروچاوە چاوپێكەوتنی لە گەڵدا كرا.

مەغدید حوسێن خدر، لەساڵی ١٩٦٨ لە گوندی مەلەكانی خۆشناوەتی لەدایك بووە، كادیری (ی.ن.ك)ە و لە ٢٠١٢/٦/١١ ی دوای نیوەڕۆ لە كۆمەڵگای شكارتە، لە ماڵی (مامۆ مەلەكی)، چاوپێكەوتنی لە گەڵدا كرا.

مستەفا عەبدولقادر ئاوڕحمان، لەساڵی ١٩٢٣ لە گوندی بالیسانی خۆشناوەتی لەدایك بووە، جوتیارە و لە ٢٧/٤/٢٠١٢ ی دوای نیوەڕۆ، لە بالیسان، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

محەمەد عەزیز عەبدولاّ، لە ساڵی ١٩٥٠ لە گوندی دواوێی خۆشناوەتی لە دایك بووە، پێشمەرگەیەو لە ١٦/١١/٢٠١٧ ی دوای نیوەڕۆ، لە گوندی دواوێ، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

مەلا ئیبراهیم خەتی، لە ساڵی ١٩٥٦ لە گوندی خەتێی خۆشناوەتی لە دایك بووە، کادیری (ی.ن.ك)ە و لە ٣٠/٣/٢٠١٣ دوا نیوەڕۆ، لە شاری ڕانیە، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

نوری بەکر عەبدولاّ، لەساڵی ١٩٥٥ لە گوندی خەتێی خۆشناوەتی لە دایك بووە، جوتیار و ئاژەڵدارە و لە ٢٨/٩/٢٠١٢ لە کاتی شەودا، لە گوندی خەتێ، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵ کرا.

نەجمەدین ڕەسوڵ محەمەد، لەساڵی ١٩٦٨ لە گوندی بێڕۆی خۆشناوەتی لەدایك بووە، فەرمانبەرە و لە ٢٥/٩/٢٠١٢ دوا نیوەڕۆ، لە گوندی بێڕۆ، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

یوسف محەمەد عەزیز، لەساڵی ١٩٧٥ لە گوندی کانی بەردی خۆشناوەتی لە دایك بووە، پێشمەرگەیە و لە ٢١/٩/٢٠١٢ ی دوا نیوەڕۆ، لە گوندی کانی بەرد، لە ماڵی خۆیدا، چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کرا.

## فەرهەنگۆك:

ئاخورِ ـ لە تەویلەی ئاژەڵاندا شوێنێك کە کەمێك بەرز بێت، چاڵێك هەڵدەکەن و ئالیکی بۆ وڵاغەکان تێدەکەن، یان دیوارێکی شێوە بازنەیی بە قورِ و بەرد نیو مەتر بەرز و نیو مەتر بەرین بە سەر کراوەیی دروست دەکەن و ئالیکی بۆ ئاژەڵ تێدەکەن.

ئاڵێنرا ـ خزێنرایە ناو ـ تێوەگلا.

ئاکۆ ـ هۆزێکی گەورەی کوردن لە سنوری رِانیە و پشدەرو ....

ئاشانە ـ باجێك بوو تورکەکان لە خاوەن ئاشە ئاویەکانیان دەستاند.

ئیحتیکار ـ قۆرخکاری ـ هەڵگرتنی خواردەمەنی بۆ کاتی بەرزبوونەوەی نرخ.

ئۆردو ـ سەربازگە.

ئیعاشەی لەشکر ـ کۆکردنەوەی خواردەمەنی بۆ سەربازەکان.

ئیعانە ـ یارمەتی و هاوکاری بۆ کەسێك یان کۆمەڵێك.

ئەولادی جاحێڵ ـ مەبەست لە کورِی گەنجە.

ئیستیلا ـ دەست بەسەرداگرتن.

ئیحتیاج ـ پێویستی.

ئەسکو ـ ملاکی گەورە ـ کەوچکی گەورە.

ئالیك ـ خۆراکی ئاژەڵ، وەکو: تێکەڵکردنی کاو جۆ.

ئەشکەڤتۆرە ـ ئەشکەوتی بچوك

ئاشووب ـ ماڵوێرانی ـ کێشە و ئاژاوە

ئەسارەت ـ کۆت و بەند ـ دەستبەسەر.

ئەسریشك ـ لە شێوەی گۆزە بووە، بنکی ئەسلێرك (گیایەکی کوێستانە لە شێوەی تور) یان ورد کردووە و هاڕیوە و خوێ و ئاویان تێکردووە، دواتر وەك هەویر شێلاویانە و ئەسریشکیان لێ دروستکردووە؛ کە دوو دەسکی هەبووە بۆ هەلگرتن، ڕەنگی دەرەوەیان بە تەنی ڕەشکردووە و دواتر کە ئامادە بووە، ڕۆنی ئاژەڵیان تێکردووە، وە تاکو کاتی پێویست تیایاندا هەلگرتووە.

بلّباس ـ هۆزێکی کوردی بەربلاّون، لە باشور و ڕۆژهەلاّتی کوردستان.

بەدەلی عەسکەری ـ پێدانی پارە بە دەوڵەتی عوسمانی لە بری سەربازیکردن.

بزنانە ـ باجێك بوو لە خاوەن ئاژەڵەکان وەردەگیرا ئەوانەی بزنیان هەبوون.

بێ عەلامەت ـ بێ هۆ.

بەم تەرحە ـ بەم پێشنیارە ـ بەم خستنە ڕووە.

بەنەزەر ـ بە بۆچوون، بە لێکدانەوە.

بادیە ـ جامەی ئاوخواردنەوە.

بەعزێ لەوان ـ هەندێك لەوان.

پرێسکە ـ پارچە قوماشێکی بچوك کە خواردەمەنی وشکی تیادا هەڵبگیرێ.

پاشۆل ـ پارچە قوماشێك کە ژنان لە پشتی خۆیان هەڵدەدا و منداڵ یان کەنگریان تیادا هەڵدەگرت. لە هەندێك شوێنیش لیچکەیەکی کەواکەیان دەخستەوە سەر شانیان و وەکو تورەکە شمەکیان دەخستەناو.

پزدان ـ پاشماوەی زانی ئاژەڵ، لە کاتی زانیدا، بۆ نموونە: کاتێ بزنێك کاریلەیەکی دەبێت، دوای نیو یان کاتژمێرێك، پاشماوەیەك لە گۆشت و پیسایی و خوێن، لە زێیەکەیەوە دەردەدات، بەوە دەگوترێت (پزدان) .

تەحسیلدار ـ بەو کەسە گوتراوە، کە بەروبوومی کشتوکاڵی کۆ کردووەتەوە.

توکلێکراو ـ نزای خراپ لێکراو.

تەبیعەت ـ سروشت ـ ڕۆژگار.

جندرمە ـ چەکداری دەوڵەت ـ هەیتە.

جایعە ـ برسێتی ـ نەبوونی خۆراك.

چەم ـ لێرەدا بە واتای (ڕوبار) دێت.

خوی ـ شارێکە کەوتووەتە باکوری خۆرهەلاتی کوردستان، لە نزیك شاری ورمێ.

خەپلە ـ ئەنگوتکە هەویر.

خەلق ـ خەڵك.

دۆڵی شاورێ ـ دەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری ڕانیە، خەڵکەکەی سەر بە هۆزی ئاکۆن.

دۆریخە ـ کلیلی دەرگای دار کە لە دار دروستکراوە.

دیماهی هات ـ کۆتایی هات.

دەفتەری مودیریە ـ نووسینگەی بەڕێوەبەرایەتی.

ڕەزانە ـ باجێك بووە خستراوەتە سەر ڕەز بەتایبەتی ڕەزی دێمەکار، بەتایبەتی دار مێو، لە خاوەنەکەی ستێنراوە.

زەنگلاڵن ـ گوندێکە لە ناوچەی پشدەر.

زەبتیە ـ زەفتیە ـ پۆلیس ـ هەیتە.

زەخیرە ـ خواردەمەنی.

زایعات ـ فەوتاو ـ زیان لێکەوتو.

زەرەری تەخریبات ـ زیانی وێرانکردن.

زی ـ جۆرە دارێکی دڕکاوییە و زۆر بەرز نابێ و لە کاتی ناچاریدا بەرەکەی دەخورێت.

سەفەربەلك ـ ڕەشبگیر ـ نەفیرعام.

سوغرە ـ بێگار ـ کارپێکردن بە شێوەی زۆرەملێ.

سەوزانە ـ ئەو جۆرە باجەیان خسترابۆ سەر گەڵای دار و سەوزەوات، دەبوایە خاوەنەکەی بڕە پارەیەك بدات.

سیپارە ـ سەرەتای خوێندن لە حوجرەو مزگەوت.

سەوقکردن ـ ڕەوانەکران، نێردرانە.

سەرانگوێلك ـ کۆمەڵە زبڵی ئاژەڵ لە بەردەم هۆڵ و تەویلە.

ستلۆکە ـ پەقرەج .

شکاك ـ هۆزێکی گەورەی کوردن لە باکوری ڕۆژهەلاتی کوردستان.

عمومی ـ گشتی.

عرووس ـ ڕووس ـ سوپای ڕووسیا.

عەساکیر ـ سەربازەکان.

فیکری ئینتیقام ـ بیرکردنەوە لە تۆڵەکردنەوە.

قۆچانە ـ باجێکە دەوڵەتی عوسمانی خستویەتیە سەر ئاژەڵی شاخدار ـ بە قۆچ، و لە خاوەن ئاژەڵەکانیان ستاندووە.

قۆچان ـ پسولەیەکە لە بەرامبەر جاج دەدرێت لەلایەن حکوومەتەوە، وەك بەڵگەیەکی خاوەنداریەتیش وایە بۆ باجدەر.

قونانە ـ باجێکە دەوڵەتی عوسمانی خستویەتیە سەر ئەو کەسانەی کە سمتیان قەڵەو بووە.

قارس ـ قرسێنەر ـ خەملێنەری بەروبوومی کشتوکاڵ.

قەبلاندن ـ مەزەندە.

قون ئاگردان ـ ڕۆخ ئاگردان ـ تەنیشت ئاگردان ـ نزیك ئاگردان.

قۆرتاف ـ چاڵ ـ قۆرت.

کوردستانی فارسی ـ ڕۆژهەلاتی کوردستان.

کدولان ـ کدوی ئاو لە سەرەوەی کونێکی تێدەکراو پاك دەکرایەوە و دانەوێڵەی تێدەکرا.

کادین ـ ژوری کۆکردنەوەی (کا) بۆ ئاژەڵ.

کولێرا ـ تاعوون.

کسۆك ـ سەگ ـ سە.

کۆربوونەوە ـ لەناوچوون ـ تیاچوون.

گەروخرانە ـ جۆرە پەتایەك بووە، دووچاری (قورگ ـ ئەوك ـ گەروو) ی مرۆڤ بووەتەوە، کۆخە و لرخەلرخ و خرەخری لەگەڵدا بووە.

گۆڕبەنان ـ شوێنێکە لە کوێستانی ناوچەی پشدەر.

گەنمانە ـ باجێك بووە خستراوەتە سەر کشتوکاڵی گەنم و لە خاوەنەکەی ستێنراوە.

گارەدان ـ داخستنی دەرگا ـ قوفڵ دان.

گردۆز ـ تێکهەڵقژان ـ بەریەککەوتن ـ هەلاو هۆسە.

گجیلە ـ بچووك.

لولاقە ـ ئێسکی قاچی ولاغی مردوو، بە وشکی و بە بێ گۆشت.

موخەسەس ـ تایبەت.

مەنگوڕ ـ عەشیرەتێکی کوردن، لە هەردوو بەشی ڕۆژهەلات و باشووری کوردستان نیشتەجێن.

مێوژانە ـ باجێك بووە خستراوەتە سەر مێوژ و لەو خێزانانە ستێنراوە کە میوژیان هەبوون.

مەرگە ـ ناوچەیەکی کوردنشینە و دەکەوێتە باشووری کوردستان.

مبایعە ـ بەڵێن دووپاتکردنەوە.

میقدار ـ ئەندازە.

مناتیقی حربی ـ سنووری جەنگ.

مهاجرین ـ کۆچکەر ـ پەناهەندە.

نیزامی ـ هێزی سەربازی ڕێکخراو.

ولاغە بەرزە ـ ئەسپ و ماین و هێستر و ...هیتر، بەتایبەتی یەکسمەکان، جگە لە گوێدرێژ.

هەیتە ـ پۆلیس.

هەنبان ـ لە پێستی ئاژەڵ دروستکراوە و خواردەمەنی وەکو دانەوێڵە و مێوژ و هەنجیری تێدەکرا.

هەڵداشتن ـ پەراوێزکردن ـ دورخستنەوە.

هۆڤیەتی ـ وەحشیگەری ـ دڕندایەتی.

هیزە ـ لە پێستی ئاژەڵ دروست کراوە، لە شێوەی مەشکە، تایبەت بووە بە تیادا هەڵگرتنی ڕۆنی ئاژەڵ.

## پاشکۆی وێنەکان:





پسولەی باج وەرگرتن کە لە گۆڤاری شمشارە بڵاوکراوەتەوە.



دیوی ناوەوەی ئەشکەوتی سەرکان لە بێتواتە.



دیوی دەرەوەی ئەشکەوتی سەرکان.



زارکی ئەشکەوتی سەرکان لە بێتواتە.



وێنەی منداڵێکی برسی.

بە گوێرەی سەرچاوەکان گرانیی گەورەی کوردستان(١٩١٤_١٩١٨ز) سەرتاپاگیربووە، هەموو شار و لادێ و دەڤەرەکانی کوردستانی گرتووەتەوە، بەڵام لە هێندێک شوێن کاریگەرییەکەی زۆرتر بووە. خەڵک لە برسان گیا و پشیلە و سەگ و گوێدرێژ و ماییناین خواردووە، جاری وا هەبووە ئەمانەیشیان دەست نەکەوتووە، گۆشتی یەکتریان خواردووە.

حەیدەر عەبدوڵڵا




بەرگ: ئیبراهیم سالح

AWER 708

Nawandi Awer

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

0 123456 789492

نرخ : ٥٠٠٠